بەم پێیە بۆمان دەرکەوت کە:

دیاری کردنی ئەم کاتانـەی نوێژ - کـە فـەرزی فیترەتـە بـە ئەستۆمانەوە - لەوپەڕی دانایی‌دایە.

﴿سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنا إلاَّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنتَ العَليمُ الحَكيمُ﴾.

اللهم صل وسلم على من أرسلْته معلماً لعبـادك، ليعلمَهم كيفيةَ معرفتِك والعبوديةِ لـك.. ومعرفـاً لكنوزِ أسمائِك.. وترجماناً لآيات كتابِ كائنـاتِك .. ومرآةً - بعبوديتِه - لجمالِ ربوبيتِك.. وعلـى آلـه وصحبه أجمعين. وارحمنا وارحم المؤمنين والمؤمنـات. آمين برحمتك يا أرحم الراحمين.

* * *

## وتەی بیست و یەکەم
### مەقامی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إِنَّ الصَّلاةَ كانَتْ عَلى الْمُؤْمِنِين كِتاباً مَوْقوتاً﴾ (النساء:١٠٣)

ڕۆژێکیان یەکێك، کە لە تەمەن و بەژن و باڵا و پلەدا لە خۆم گەورەتر بوو، پێی وتم:

(بەجێهێنانی نوێژ شتێکی جوان و شیرینە، بەڵام دووپات بوونەوەی لە پێنج کاتدا و لە ماوەی یەك ڕۆژدا، گەلێ زۆرە. ئەم زۆرییەش مرۆڤ بێزار دەکات)!

پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم قسەیەدا تێپەڕی، گوێم لێ بوو نەفسی خۆیشم هەمان قسەی دەکردەوە!

منیش کە بە وردی سەرنجم لە نەفسی خۆم دا، بۆم دەرکەوت ئەم نەفسە لە ڕێی تەمبەڵییەوە هەمان دەرسی لە شەیتان وەرگرتووە. ئەو کاتە زانیم کە ئەو پیاوەی باسم کرد، بە ناوی هەموو نەفسێکی ئەمارەوە ئەو قسەیەی کرد، یان بەبێ ویستی خۆی پێی درکێنرا!

کە ئەمەم بۆ دەرکەوت (لەبەر خۆمەوە) وتم:

مادەم نەفسی خۆیشم بەدخوازە، ئەوا دەبێ لە خۆمەوە دەست پێ بکەم. چونکە هەرکەسێ نەفسی خۆی بۆ چار نەکرێت، دیارە هی خەڵکی تری هەرگیز پێ چار ناکرێت!

لەبەر ئەوە، ڕووم لە "نەفس"ی خۆم کرد و پێم وت:

نەفسەکەم!

وا دیارە تۆ نوقمی نەفامی‌یەکی ئالۆز بوویت و، لەسەر پێخەفی تەمبەڵی خەوی بێ‌ئاگاییت لێ کەوتووە.

جا لە بەرامبەر ئەو قسەیەی کە دەرت‌بڕی، ئەم پێنج "بێدارکردنەوە"یەم لێ ببیستە و وەریان بگرە:

□ بێدارکردنەوەی یەکەم:

ئەی نەفسی بەدبەختم!

ئایا تەمەنت هەمیشەییە؟

ئایا هیچ پەیمانێکی ڕاست و بێ گومانت دراوەتێ کە تا ساڵێکی تر، تەنانەت تا سبەینێ بمێنیت و لەم دنیایە کۆچ نەکەیت؟

دیارە هیچ کام لەمانە نی‌یە. کەواتە یەك شت هەیە لە نوێژکردن بێزاری کردوویت، کە ئەویە بە وەهمی خۆت پێت وایە هەرگیز نامریت و لە دنیادا هەمیشەیی دەبیت. لەم ڕێگایەشەوە وات لێ هاتووە ناز بکەیت و پێت وابێت کە لە دنیادا بۆ خۆشی و ڕابواردن هەر دەمێنیتەوە.

جا ئەگەر لەوە تێبگەیت کە تەمەنت یەکجار کورتە و لە ناکاودا بێ هوودە دەڕوات و لەدەستت دەردەچێ، ئەوا بە جوانی بۆت دەردەکەوێت کە بەکارهێنانی بەشێك لەو بیست و چوار بەشەی (ژیانی ڕۆژانەت) لە بەجێهێنانی خزمەتگوزاری‌یەکی جوان و فەرمانبەری‌یەکی شیرین و پشوودەردا، کە لە هەمان کاتیشدا هۆی میهرەبانی و ژیانێکی پڕ لە بەختەوەریی هەمیشەییە، هەرگیز نابێت بە مایەی بێزاری، بەڵکو ئەو کاتە نوێژکردن دەبێت بەهۆی ورووژاندنی شەوق و زەوقێکی جوان و بەرز و ڕاستەقینە لە مرۆڤدا.

□ بێدارکردنەوەی دووهەم:

ئەی نەفسە چلێسەکەم!

تۆ هەموو ڕۆژێك نان دەخۆیت و، ئاو دەخۆیتەوە و، هەناسە دەدەیت.. ئایا ئەم دووپات بوونەوە ڕۆژانەیە نابێت بە مایەی بێزاری؟

بێ گومان نەخێر..

چونکە دووپات بوونەوەی شتی پێویست نەك هەر نابێت بە مایەی بێزاری، بەڵکو چێژ و لەزەتیشی تازە دەکاتەوە.

لەبەر ئەوە، ئەو نوێژکردنەی کە خۆراکە بۆ "دڵ"م و، ئاوی ژیانە بۆ "گیان"م و، سروەی فێنکی و حەوانەوە بەو لایەنە ناسك و پەنهانەم دەبەخشێت کە پێی دەوترێ: "السّرالإنساني" .. ئەو نوێژە هەرگیزاو هەرگیز زویر و بێزارم ناکات.

بەڵێ، ئەو "دڵ"ەی کە گمرۆدەی ئازار و پەژارەیەکی بێ سنوور بێت و کەوتبێتە داوی چەندین ئاوات و ئازاری بێ کۆتاییەوە، ئەو "دڵ"ە، هێز و خۆراکی خۆی تەنها لەوەدا دەبینێتەوە کە بەوپەڕی توانایەوە بە دەستی نزا و لالآنەوە لە دەرگانەی ئەو خواوەندە میهرەبانە بدات کە دەستەلآتدارە بەسەر هەموو شتێکدا.

"گیان"یش کە لەگەڵ زۆربەی ئەو بوونەوەرانەی بە پەلە دێن و دەڕۆن، پەیوەندیی هەیە، هەرگیز ئاوی ژیان نانۆشێت و تامی ناکات، تەنها بەوە نەبێت کە لە ڕێی نوێژەوە ڕوو بکاتە سەرچاوەی میهرەبانیی ئەو خوایەی کە خۆشەویستە و پەرستراوی هەمیشەییە.

ئەو لایەنە نیان و ناسك و هەستیار و نەبینراوەش کە پێیدەوترێ: "السّـــر الإنساني" و بریتی‌یە لە شتێکی نوورانی و سەر بە پەروەردگار و بۆ هەتاهەتایی

بەدی هێنراوە و بە سروشتیش حەزی لە ژیانێکی هەمیشەییە و، ئاوێنەیەکی ڕەنگدەرەوەی درەوشانەوەکانی نووری زاتی گەورەی کردگارە..

لەم لایەنە ناسکەی کە ئەم سیفەتانەی هەیە، لە نێوان سەختی و پاڵەپەستۆی ئەم بارە دژوار و تەنگ و تاریکانەی ژیانی دنیادا، پێویستی‌یەکی زۆری بە هەناسە و پشوودان هەیە..

خۆ ئەگەر لە دەروازەی نوێژەوە نەبێت، هەرگیز ئەو هەناسە و پشوودانەی دەستگیر نابێت.

□ بێدارکردنەوەی سێهەم:

ئەی نەفسی بێئارامم!

تۆ کە "ئەمڕۆ" یادی ماندووبوونی ئەو پەرستشانەت دەکەیتەوەکە لە ڕۆژانی "ڕابوردوو"دا بەجێت هێناون و ئەو نوێژانەش کە پێشتر کردووتن، بێ ئارامی و شڵەژانی خۆت دەردەبڕیت..

پاشان هەر "ئەمڕۆ"ش کە بیر لە ئەرکی پەرستش و خزمەتگوزاری‌یەکانی نوێژکردن و ئازار و بەڵا و گیروگرفتەکانی ڕۆژانی "داهاتوو" دەکەیتەوە، ئۆقرەت لەبەر دەبڕێ و بێ ئارامی دەنوێنیت!

جا ئایا هەر کەسێك خاوەنی تۆزقاڵێك هۆش و ژیری بێت کاری وا دەکات؟ یان هەڵوێستی وای لێ دەوەشێتەوە؟

تۆ لەم ڕەفتارەتدا وەك ئەو سەرکردە نەزانە وایت کە هێزێکی گەورەی سوپاکەی ئاراستەی دەستەڕاستی سوپای دوژمن کرد، لەو کاتەدا کە ئەو بەشەی سوپای دوژمن لەوێ نەمابوون و هاتبوونە ڕیزی سوپاکەی ئەمەوە و بووبوونە پاڵپشتی! ئنجا بەشەکەی تری هێزەکەی بۆ سەر دەستەچەپی دوژمن نارد، لە کاتێکدا کە هیچ سەربازێکی ئەوانی تێدا نەمابوو!

دوژمنیش ئەم هەل و دەرفەتەی قۆزتەوە و، هێرشێکی چاپوکانەی هێنایە سەر ناوجەرگەی سوپاکەی ئەم پادشایە و، خۆی و سوپای - بە تەواوی - تەفروتوونا کرد.

بەڵێ، تۆ لەم سەرکردە هەڵەشەیە دەچیت!

چونکە هەموو ماندوویی و ئازارەکانی ژیانی ڕابوردوو، ڕۆشتن و بەسەرچوون. واتە ئازارەکانی ڕۆژانی ڕابوردووت نەماون، بەڵام لەزەت و خۆشی‌یەکانی هەر ماون و پاشان ماندووبوون و ئەرکەکانیشی بوون بە پاداشت و بژت پاشەکەوت کراون. کەواتە لە ڕاستیدا ئەو ئازارانەی ڕابوردوو، بێ تاقەتی و بێ ئارامی بەرهەم ناهێنن، بەڵکو شەوق و شادمانی‌یەکی نوێ و هەوڵ و کۆششێکی هەمیشەییت پێ دەبەخشن و هەڵت دەنێن کە پتر هەنگاو بەرەو پێش بنێیت.

بیرکردنەوەش لە ڕۆژانی داهاتوو - کە هێشتا نەهاتوون - لە ڕاستیدا جۆرە نەفامی و نەزانی‌یەکی تایبەتی‌یە و، وەك ئەوە وایە لە ترسی برسێتی و تینوێتی‌یەك کە لەوانەیە لە ڕۆژانی داهاتوودا بێنە ڕێت، هەر لە ئێستاوە دەست بە هاوار و گریان بکەیت!

جا مادەم ڕاستی وایە، ئەوا تۆش - گەر خاوەنی تۆزقاڵێك هۆش و ژیریت - بیر لە پەرستشی "ئەمڕۆ"ت بکەرەوە..

بەڵێ، هەر تەنها ئەمڕۆ و بەس.

بە خۆت بڵێ:

"وا سەعاتێکی ئەمڕۆم لە ئەرکێکی گرنگی بەلەزەت و جواندا.. لە خزمەتگوزاری‌یەکی بەرزی بەپیت و پاداشتی کەم ئەرکدا بەسەر دەبەم". کە

ئەنجامیشت دا، هەست بە نەمانی ئازار و کەمتەرخەمی‌یەکانت دەکەیت و دەبینیت هیممەت و چالاکی‌یەکی خۆش و بەتامیان بۆ بەجێ هێشتوویت.

دەسا ئەی نەفسی بێ ئارامم!

بزانە کە سێ جۆر ئارامگرتنت لە بەردەمدایە و لێیان بەرپرسیاریت:

یەکەم:

ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی و خواپەرستی.

دووهەم:

ئارامگرتن لەسەر خۆپاراستن لە تاوانکاری و یاخی بوون.

سێهەم:

ئارامگرتن لە کاتی بەڵا و موسیبەتدا.

جا مادەم ئەم سێ جۆرە ئارامگرتنەت لە ئەستۆدایە و، تۆش گەر مرۆڤێکی زیرەك و هۆشیاریت، ئەوا فەرموو لەو ڕاستی‌یە بەرزەی کە لە نموونەی سەرکردەکەدا هەیە، پەند و ئامۆژگاری وەربگرە و، بەوپەڕی جوامێری و هیممەت و غیرەتەوە هانا بۆ لای خوای گەورە ببە و بڵێ: "یا صبور"!

پاشان هەر سێ جۆرەکانی ئارامگرتن بخەرە ئەستۆی خۆت و، پشت بەو هێزی ئارامگرتنە ببەستە کە خواوەند لە تۆدا داینـاوە. چونکە هەر تەنها ئەو هـێزە سـەروزیادی بەرەنگاربوونـەوەی سـەرجەمی ئـەو ئـازار و ئـەرك و گیروگرفتە زۆرانەن کە لە ژیاندا دێنە ڕێـت، بە مەرجێ ئەم هێزەت بەم لا و بەو لا و لە شتی لاوەکیدا بڵاو نەکەیتەوە و لە دەستی خۆتی دەرنەکەیت!

☐ بێدارکردنەوەی چوارەم:

ئەی نەفسی سەرکەشم!

ئایا ئەم پەرستشە ئەرکێکی بێ ئەنجام و بێ مەبەستە؟ یـان ئایا پاداشتەکەی بە کەم دەزانیت تا بێزاریی لە دەست دەربېڕیت؟

خۆ ئەگەر هەرکام لە ئێمە بەڵێنی پارە و پوولێکی پێ بدرێت، یان بۆ کار کردن زۆری لێ بکرێت، هەر لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارە - بە بێ بێزاری دەربڕین - بۆ کار کردن لێدەبڕێت و خۆی ماندوو دەکات..

ئایا ئەو نوێژەی کە لەم میوانخانە کاتی‌یەی دنیادا ئارامی بە "دڵ"ی کۆڵەواری مرۆڤ دەبەخشێت و دەبێت بە توێشووی ئەو دڵە..

ئەو نوێژەی کە خۆراك و ڕووناکیی ئەو مەنزڵەیە کە چار نی‌یە دەبێ بڕۆیتە ناویەوە "کە گۆڕەکەتە"..

ئەو نوێژەی کە بۆت دەبێت بە "تەبریبە" و پەیمان لەو دادگایەدا کە بێ هیچ گومانێك تیایدا حەشر دەکرێیت..

ئەو نوێژەی کە لەسەر پردی سیراتدا - کە دەبێ بەسەریدا تێ بپەڕیت - بۆت دەبێت بە بوراق و ڕووناکی، تاکو بە ئاسانی بیبڕیت..

ئەو نوێژەی کە ئەم هەموو بەرهەمانەی هەیە، تۆ هێشتا بە شتێکی بێ ئەنجامی دەزانیت؟ یان پاداشتەکەی بە کەم لەقەڵەم دەدەیت؟

خۆ ئەگەر کەسێك بەڵێنی "سەد" لیرەت بداتێ، ئەوا بێ هیچ بێزاربوونێك "سەد" ڕۆژی ڕەبەق کاری بۆ دەکەیت و پشت بە بەڵێنەکەی دەبەستیت، لەکاتێکدا کە دەشزانیت لەوانەیە بەڵێنەکەی نەباتەسەر..

ئایا هەڵوێستت بەرامبەر بەو کەسە چی‌یە کە بەڵێنی پێ داویت و دڵنیاشی لەوەی کە بەڵێنەکەی دەباتەسەر؟

ئەوەتا هەر بۆ خۆت دەزانیت کە نەبردنەسەری بەڵێن لای ئەو کارێکی مەحاڵە. نابینیت وادەی پاداشتی بەهەشت و بەڵێنی دیاری‌یەکی گەلێ مەزنی پێ داویت، کە بەختەوەریی هەمیشەیی‌یە، لە بەرامبەر بەجێهێنانی ئەرك و فەرمانبەری‌یەکی ئاسان لە ماوەیەکی کەم و کورتی تەمەندا؟

ئایا بیر لەوە ناکەیتەوە کە ئەگەر ئەم خزمەتگوزاری و کارمەندییە کەم و ئاسانە ئەنجام نەدەیت.. یان ئەنجامی بدەیت، بەڵام بە بێ هیچ حەز و تاسە و شەوقێك و بە چەشنێکی پچڕ پچڕ بەجێی بهێنیت..

ئایا ئەم ڕەفتارەت لەوە ناگەیەنێت کە تۆ گاڵتە بە دیارییەکەی ئەو دەکەیت و لە بەڵێنەکەیدا تۆمەتباری دەکەیت؟

ئایا ئەو کاتە - بۆ ئەوەی لەسەر ئەو هەڵەیەت سزا بدرێیت - شایانی ئازارێکی سەخت نابیت؟

ئایا ئەمە هیممەتت نابزوێنێت کە ئەم فەرمانبەرییە ئاسانە لە ترسی سزای بەندیخانەی هەمیشەیی دۆزەخ بەجێ بهێنیت؟ لە کاتێکدا کە لە ترسی ئەشکەنجەی بەندیخانەی دنیا چەندەها کاری قورسی بە ئەشکەنجە و ئازار ئەنجام دەدەیت، کە دەشزانیت سزای بەندیخانەی دنیا هەرگیز لە هی بەندیخانەی هەمیشەیی دۆزەخ ناچێت و هاوتای یەکتری نین؟

□ بێدارکردنەوەی پێنجەم:

ئەی نەفسی دنیاپەرستم!

ئایا ئەم تەمبەڵی و کەمتەرخەمییەت لە نوێژ و پەرستشدا هی سەرقاڵی و کاروباری دنیاکەتە؟ یان بەهۆی بێ کاتی و خەفەتی دەرد و ئازاری ژیانەوەیە کە بەو جۆرە سەرت ناپەرژێتە سەریان؟

گەلێ سەیرە! خۆ تۆ تەنها بۆ دنیا دروست نەکراویت تا تەنها سەرقاڵی دنیا بیت!

باش بزانە کە هەرچەندە تۆ بە سروشت لە هەموو زیندەوەرانی دنیا بالاتری، بەڵام هەرگیز بە ئەندازەی بچووکترین چۆلەکە توانای بەدەستهێنانی پێداویستییەکانی ژیانی دنیات نییە..

ئەدی بۆچی لەم بەراوردەوە تێناگەیت لەوەی کە تۆ وەك ئاژەڵ و زیندەوەرانی تر نییت تاکو ئەرکی سەرەکیی ژیانت بریتی بێت لە بایەخدان بە ژیانی دنیا؟

تۆ (وەك مرۆڤێکی ڕاستەقینە) کارمەندی و ئەرکی سەرەکیت لە ژیانی دنیادا بریتی‌یە لە هەوڵدانی بێ وچان بۆ ژیانێکی هەمیشەیی.

لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی ئەو سەرقاڵی و کاروبارە دنیاییانەی کە باسیان دەکەیت هیچ پەیوەندی‌یەکیان بە تۆوە نی‌یە و بە زۆر خۆتیان تێ هەڵدەقورتێنیت، بەمەش کاتی هەرە بەنرخی خۆت بە شتی بێ هوودە و بێ سوودەوە لە دەست دەردەکەیت. وەك ئەوەی کە دەتەوێ بزانیت ژمارەی مریشك لە ئەمریکادا چەندە و، ئەڵقەکانی دەوری هەسارەی کەیوان(زُحَل) لە چ جۆرێکن!! وەك بتەوێت لەم ڕێیەوە شتێك لە بارەی "ئامار" و "گەردووونناسی"یەوە فێر ببیت!

ئیتر بەم جۆرە لەوەی پێویست و گرنگە وازی لێ دەهێنیت و، سەرگەرمی کاری وا بێ هوودە دەبیت وەك پێت وابێت هەزاران ساڵ لە دنیادا دەژییت و تەمەن بەسەر دەبەیت!

خۆ ئەگەر دەشڵێیت: ئەو شتەی لە پەرستش دوورم دەخاتەوە و ساردم دەکاتەوە، ئەم شتە کەم نرخانە نین، بەڵکو چەند کاروبارێکی ئەوتۆن کە بۆ ژیانی دنیا پێویستن ئەنجامیان بدەم..

گەر وا دەڵێیت، ئەوا گوێ ڕابگرە با ئەم نموونەیەت بۆ باس بکەم:

ئەگەر کرێی ڕۆژانەی کەسێك "سەد فلس" بێت و، یەکێکی تر بێت و پێی بڵێت:

(وەرە بۆ ماوەی (دە) خولەك ئەم جێگایە هەڵبکەنە، چونکە یەك دانە گەوهەر یان بەردێکی گرانبەهای - سەد لیرەیی - تێدایە و بۆ خۆتی دەربهێنە)..

ئەگەر ئەم کرێکارە بەهانە بهێنێتەوە و بڵێت:

(نەخێر.. کاری وا ناکەم، چونکە ڕۆژانەکەم کەم دەکاتەوە)!..

چەندە کارێکی شێتانە دەکات و چ بەهانەیەکی بێ نرخ دەهێنێتەوە؟!

تۆش وەکو ئەم کرێکارە وایت! چونکە ئەگەر واز لە نوێژکردن بهێنیت، ئەوا هەرچی بەروبوومی ئەو کۆششانەی کە لەم ڕەز و باخ و بێستانەتدا کردووتن، تەنها لەوەدا دەبێت کە دەرامەتێکی کەم نرخی دنیاییت تێدا دەست دەکەوێت و، لە خێر و بەرەکەتیشی بێ بەش دەبیت.

بەڵام ئەگەر کاتەکانی پشوودان و حەوانەوەت - کە لە نێوان کاتەکانی کار کردندان - لە نوێژ کردندا بەسەر بەریت، کە دەبێتە مایەی پشوودانی دەروون و حەوانەوەی گیان، ئەوا دوو کانگا و سەرچاوەی مەعنەوی و هەمیشەییت دەست دەکەوێت و بۆت دەخرێنە سەر دەرامەت و توێشووەکانی ئەودنیا و دەرامەتە پیرۆزەکانی ئەم دنیاشت.

ئەو دوو کانگا و سەرچاوە مەعنەوی‌یانەش ئەمانەن:

*کانگای یەکەم:*

ئەو کاتە بەهۆی نییەتی پاك و پڕ لە ئیخلاس و نیازی بێ گەردتەوە، بەشی خۆت لە تەسبیحاتی ئەو گوڵ و بەروبووم و ڕووەکانەی کە لە باخ و ڕەزەکەتدا بەرهەمت هێناون، وەردەگریت[1].

---

(١) ڕووی دەمی ئەم گوفتارە لە باخەوانێکی خەڵکی گوندی (بارلا)یە و وەڵامی پرسیارێکی ئەوە. (دانەر)

*کانگای دووەمم:*

ئەوەیە کە هەر کەسێك - چ دز بێ و چ کرێکار، تەنانەت ئاژەڵیش - هەر شتێك لە بەروبوومی باخ و ڕەزەکەت بخوات، وەك خێرێکی هەمیشەیی و بەردەوام لای خوای گەورە بۆت دەنووسرێت، بە مەرجێ خۆت بە وەکیل و فەرمانبەرێکی دابەشکردنی ماڵی خوا دابنێیت لەم کارەدا. واتە بەو مەرجەی کە بە ناوی ڕۆزیدەری ڕاستەقینە و لە پێناوی ڕەزامەندیی ئەودا ئەم کارانە ئەنجام بدەیت.

ئێستا سەرنج لەو کەسە بدە کە وازی لە نوێژکردن هێناوە و، بزانە چ زیانێکی گەورە دەکات و چەندە لەو سامانە زۆرە و چۆن لەو دوو کانگا و سەرچاوە بەپیت و هەمیشەییانە بێ بەشە، کە هەردەم هێز و شەوقی مەعنەوی بۆ کار و کۆشش لە مرۆڤدا دروست دەکەن؟

سەرنجی بدە و بزانە کاتێ کە دەگاتە تەمەنی پیری، چۆن بێزار دەبێت و لەبەر خۆیەوە بە خۆی دەڵێت : (بۆ کێی بکەم؟ خۆ دەبێ سبەینێ ئەم دنیایە بەجێ بهێڵم! کەواتە بۆچی خۆم ماندوو بکەم)؟

بەم شێوەیە خۆی دەهاوێتە ناو باوەشی تەمبەڵی و کەمتەرخەمی‌یەوە.

بەڵام مرۆڤی یەکەم وا ناڵێت. بەڵکو دەڵێت :

(هەردەم لەگەڵ کردەوەکانمدا، کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە پەرەسەندن و زیادبووندان، بۆ ئیش و کاری حەلاڵ تێدەکۆشم، تاکو ڕووناکیی زیاتر بەرەو ئاخیرەت بەڕێ بکەم).

بە کورتی:

ئەی نەفسەکەم!

بزانە کە "دوێنێ" ڕۆشت و لەدەست دەرچوو.. "سبەینێ"ش هێشتا نەهاتووە، هیچ بەڵێن و پەیمانێکیشت نەدراوەتێ کە تۆ "سبەینێ"ت هەیە و

دەمێنیت تا بیبینیت. کەواتە تەنها "ئەمڕۆ" بە تەمەنی ڕاستەقینەی خۆت بزانە. کەمترین شتێکیش کە تۆ لەمڕۆدا بتوانیت بیخەیتە ناو سندووقی پاشەکەوت کردنی دواڕۆژتەوە، تەنها یەك سەعاتە کە لە مزگەوتدا یان لەسەر بەرماڵ بەسەری بەریت، تاکو دواڕۆژی ڕاستەقینە و هەمیشەیی خۆتی پێ دەستەبەر بکەیت.

ئەوەش بزانە کە هەموو ڕۆژێکی نوێ لە ژیاندا دەرگایەکە ڕووەو جیهانێکی نوێ - بۆ تۆ و هەموو کەسێکی تر - دەخرێتە سەرپشت.

جا ئەگەر لەو ڕۆژەدا نوێژەکانت نەکەیت، ئەوا کاتێ ئەو ڕۆژە کۆتایی پێ دێت، بە تاریکی و سکالاّ و خەفەتباری‌یەوە بەرەو جیهانی غەیب کۆچ دەکات و، سبەینێش لە دواڕۆژدا شایەتیت لەسەر دەدات.

هەرکام لە ئێمە جیهانێکی تایبەتیمان لە نێوان جیهانی گشتیدا هەیە، جۆری ئەو جیهانە تایبەتی‌یەی هەرکامێکیشمان شوێنی دڵ و کردەوەکانمان دەکەوێت.

(واتە: دڵ و کردەوەکانمان چۆن بن، ئەو جیهانەش بەو جۆرە ڕەنگ دەداتەوە)..

ئەو جیهانە تایبەتی‌یە چەشنی "ئاوێنە"یە، ڕەنگ و شێوەی شتان وەك خۆیان دەردەخات. جا ئەگەر ئاوێنەکە ڕەش و تاریك بێت، وێنەکان ڕەش دەردەخات و، گەر پاك و خاوێنیش بێت ئەوا بە ڕوونی پیشانیان دەدات. دەنا وێنەکان ناشیرین دەکات و بچووکترین شت وەك گەورەترین شت دەردەخات.

تۆش - ئەی نەفسەکەم! - تەنها لە ڕێی دڵ و عەقڵ و کردەوەکانتەوە و، بەپێی نیاز و ویست و ئارەزووی خۆت دەتوانیت ئەو جیهانە تایبەتی‌یەت وا

لێ بكەیت كە یان شایەتیت بۆ بدات لەسەر كردەوەی چاك، یان شایەتیت لەسەر كردەوەی خراپ لێ بدات.

بەم جۆرە، ئەگەر نوێژەكانت بەجێ هێنا و ئاراستەی خواوەندی "شكۆمەند" و بەدیهێنەری خۆت كردن، ئەوا یەكسەر ئەو جیهانەی خۆت ڕووناك دەبێتەوە. وەك بڵێی بە "نیەت"ی نوێژەكەت كلیلی دەرگای ڕووناكیت بە دەستەوە گرتووە و ئەو دەرگایەت پێ كردووەتەوە و، چرای نوێژەكەت دەوروبەری تۆی ڕووناك كردووەتەوە و تاریكیی تێدا نەهێشتووە.

ئیتر ئەو كاتە هەرچی دڵتەنگی و خەفەت لە دنیا تایبەتییەكەی دەوروبەرتدا هەن، هیچیان نامێنن و، هەست دەكەیت و بۆ خۆت دەبینیت كە جیهانەكەت لە ڕاستیدا بریتییە لە ڕێسایەكی سەرانسەر دانایی و، نووسراوێكی پڕاوپڕ لە واتای ئەوتۆ كە بە قەڵەمی توانستی پەروەردگار نووسراوەتەوە.

ئنجا لەمەوە یەكێك لە نوورەكانی ئایەتی: ﴿اللهُ نورُ السَّموات والأرضِ﴾ (النور:٣٥) دەڕواتە ناو دڵتەوە و، جیهانی ئەو ڕۆژەت بۆ ڕووناك دەكاتەوە. ئنجا لە خزمەت خواوەندیشدا شایەتیی ئەوەت بۆ دەدات كە ئەو ڕۆژەت ڕووناك بووە.

ئێستاش براكەم!

هەرگیز نەڵێیت:

(نوێژی من لەكوێ و، حەقیقەتی ئەم نوێژەی تۆ باسی دەكەیت لەكوێ)؟

نەخێر هەرگیز وانەڵێیت..

چونكە هەروەك ناوكە خورمایەك سەرجەم سیفەت و ئەدگارەكانی درەختێكی خورمای مەزنی تێدایە، مەگەر جیاوازی تەنها لە گەورە و

بچووکی و کورتی و درێژیدا بێت، هەر بەو جۆرەش نوێژی عەوامەکانی وەك من و تۆ بەشێکی لەو نوورە و نهێنی‌یەکی لە نهێنی‌یەکانی ئەو حەقیقەتە تێدایە، وەك حەقیقەتی ئەو نوورەی کە لە نوێژی هەر وەلی‌یەکدا هەیە، با ئەو کەسە خۆیشی هەستی پێ نەکات!

دیارە پلەکانی ڕووناکیی نوێژ، بە چەشنی پلەکانی نێوان ناوکە خورما و درەختەکەی، جیاوازی‌یان لە نێواندایە.

جا هەرچەند پلەکانی نوێژ گەلێ زیاترن، بەڵام هەموو پلەیەك لەو پلانە بناغەیەکی لەو ڕاستی‌یە نوورانی‌یە تێدایە.

اللهمَّ صَلِّ وسلم على مَنْ قال:

"الصلاةُ عمادُ الدين"(٢) وعلى آله وصحبه أجمعين(٣).

---

(٢) بڕوانە: البيهقي، شعب الإيمان ٣/٣٨؛ الديلمي، المسند ٢/٤٠٤؛ الترمذي، الإيمان ٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ٥/٢٣١،٢٣٧. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

(٣) لە چاپە تورکی و عەرەبی‌یەکەدا، دوای ئەم باسە و لەم شوێنەدا، "بریسکەی سیازدەهەم"ی کتێبی (بریسکەکان) دانراوە. ئێمەش لە چاپی یەکەمدا بە هەمان شێوە بڵاومان کردەوە. بەڵام لەم چاپەدا لەبەر ئەوەی لەو بریسکەیەمان وەکو کتێبێکی سەربەخۆ بە ناوی: (حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان) بڵاو کردووەتەوە و، لەبەر ئەوەش نرخی گران نەکەوێت لەسەر کڕیار، لەو بەشەمان لەم چاپەدا لابرد. خوێنەری بەڕێز دەتوانێت لە کتێبی ناوبراودا بیخوێنێتەوە. (وەرگێڕ)

## چەند یادخەرەوەیەك لە بابەتی

# ناسینی خوای گەورە

### لە کتێبی (بریسکەکان)

پازدە یادخەرەوەن لە "زەهرە"ەوە درەوشاونەتەوە

# پێشەکی

دوازده ساڵ پێش ئێستا[1] چاودێریی خواوەنـدی پـەروەردگار ئـاوڕی میـهرەبانیی لـێ دامـەوە و، لـە کـاتی تێڕامـانێکی "فیکـری" و گەشـت و گـەڕانێکی "دڵـی" و ڕوونبوونێکـی "گیـانی" و، لـە دەمـی بڕینـی پلـە و قۆناغەکانی ناسینی خوای گەورەدا، ئەو مەسەلانەی لەمـەڕ "یەکتایی خـوای گـەورە" لـە ڕووم درەوشـانەوە، لـە شـێوەی چـەند یادخەرەوەیـەك و لـە پەیامەکانی "زەهرە" و "شوعلە" و "حەببە" و "شەممە" و "ذەڕڕە" و "قـەطرە" و هاوچەشنیاندا، بە زمانی عەرەبی تۆمارم کردن.

جـا لەبەر ئەوەی ئەو یادخـەرەوانە لـە پێنـاوی پیشـاندانی "سـەرەتای ڕاسـتییەکی مـەزن و فـراوان و، بـۆ مەبەسـتی دەرخسـتنی "یـەکێك" لــە تیشـکەکانی نوورێکـی ڕوونـاك و درەخشـان، نووسـران.. ئـەوا شـێوە و ڕوخساری چەند تێبینی و ئاگادارییەکیان لەخۆ گرت.

ئنجـا تەنـها بۆ خۆیشم نووسیبوومن، کـە ئەمـەش بـوو بـە مایـەی ئـەوەی سوودی کەمیان لـێ وەربگیرێت، بە تایبەتی بەشی هـەرە زۆری بـرا دڵسۆز و بێگەردەکانم زمانی عەرەبییان نەخوێندووە.

---

(١) واتە ساڵی ١٣٤٠ك (١٩٢١ز).

هێندەش ئەو برایانە داوای ڕوونکردنەوەی ئەو یادخەرەوانەیان لێ دووپات کردمەوە هەتا ناچار بووم چەند ڕوونکردنەوەیەك لەسەر هەندێکیان بە زمانی تورکی بنووسم و ئەوانی تریشیان دەقاودەق و بێ دەستکاری وەربگێڕم. لەبەر ئەوەش دەستکاریم نەکردن چونکە "سەعیدی نوێ" کاتێ لە سەرچاوەی "زانستی حەقیقەت" دەستی بە هەڵگۆزینی "ڕاستی" کرد، ئەو بێداری و تێبینی‌یانەی لە پلەیەکی وەك پلەی "شهود"دا بینی.

لەبەر ئەوە، هەندێ لەو ڕستانەی کە لە چەند پەیامێکی تردا هەن، لێرەشدا باس کراونەتەوە. هەندێکی تریشیان زۆر بە کورتی هێنراون و بە باشی ڕوون نەکراونەتەوە، نەبادا چێژە ناسکەکانی ئەو ڕستە و دەستەواژانە لە کاتی ڕوونکردنەوەدا لە دەست بچن و وەك خۆیان نەمێنن.

سەعیدی نوورسی

* * *

## یادخەرەوەی یەکەم

کاتێ خۆی بەم جۆرە لەگەڵ خۆمدا دوابووم:

ئەی سەعیدی بێ ئاگا!

بزانە! کارێکی گەلێ نەشیاو دەکەیت گەر دڵت بە شتێکەوە ببەستیت کە دوای لەناوچوونی ئەم دنیایە لەگەڵ تۆدا نامێنێتەوە، تەنانەت بە کاولبوونی دنیا ئەویش لێت جیا ببێتەوە. چونکە مرۆڤ کارێکی ژیرانە ناکات گەر دڵی پابەندی شتی لەناوچوو بکات!

چ جای لەو شتەی کە بە تەواوبوونی ئەو سەردەمەی تیایدا دەژیت، وازت لێ دەهێنێت و پشتت تێدەکات!

بەڵکو چ جای ئەو شتەی کە لە گەشتی بەرزەخدا هاوڕێت نابێت!

بەڵکو چ جای ئەو شتەی کە هەتا دەرگای گۆڕەکەت لەگەڵتدا دێت!

بەڵکو چ جای شتێ کە دوای ساڵێك یان دوو ساڵ، بە تەواوی و هەمیشەیی بەجێت دەهێڵێت و، تاوانەکەشی دەخاتە ئەستۆی تۆوە!

بەڵکو چ جای شتێ کە هەر لەو دەمەدا دڵت پێی خۆشە، ئەو بەجێت دەهێڵێت و دەستبەردارت دەبێت!

ئەگەر خۆت بە ژیر و وریا دەزانیت، گوێ بەمانە مەدە و خەمیان پێ مەخۆ. واز لە هەموو ئەو شتانە بهێنە کە ناتوانن لە گەشتی هەمیشەییدا هاوڕێت بن، ئەوانەی کە لە ژێر پاڵەپەستۆی ئاڵوگۆڕەکانی دنیا و ڕووداوەکانی بەرزەخ و تەقینەوەکانی قیامەتدا، تیادەچن و نامێنن.

ئایا نابینیت لایەنێکی ناسك و نیانت هەیە کە بە: "هەمیشە" و "شتی هەمیشەیی" نەبێت هەرگیز بە شتی تر ڕازی نابێت و جگە لەوە بۆ هیچی تر ناڕوانێت و ملی بۆ کەچ ناکات؟ بە ڕادەیەك کە ئەگەر هەموو دنیای پێ بدرێت، هێشتا هەر ئەو پێویستی‌یە سروشتی‌یەت تێر و دڵنیا نابێت؟

ئەم لایەنەی کە ئاوا داخوازی "هەمیشە" و هۆگری "هەمیشەیی"یە بریتی‌یە لە دەستەڵاتی هەست و لایەنە ناسکەکانت. دەسا تۆش گوێڕایەڵی فەرمان و داخوازی‌یەکانی ئەو لایەنە ناسکانەت بە، ئەوانەی کە بۆ خۆیان گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانی بەدیهێنەری دانایانن..

بەڵێ، گوێڕایەڵیی ئەو لایەنانەت بکە و، لەم ڕێیەوە خۆت لە هەموو پەژارەیەك ڕزگار بکە.

## یادخەرەوەی دووهەم

لە خەونێکی ڕاستی ئاوێتەی حەقیقەتدا بە خەڵکیم دەوت:

مرۆڤینە!

یەکێك لە دەستوورە پیرۆز و فەرمانە دامەزراوەکانی قورئان ئەوەیە کە:

جگە لە خوا کەس لە خۆت بە مەزنتر مەزانە نەوەك بیگەیەنیتە پلەی "پەرستن"..

خۆیشت لە هیچ شتێك بە گەورەتر دامەنێ با دەرگای خۆ بە گەورە زانین(التکبر)ت لێ نەکاتەوە.

چونکە هەروەك هەموو بەدیهێنراوان لەوەدا یەکسانن کە هیچیان "پەرستراو" نین، بە هەمان جۆر لەوەشدا یەکسانن کە هەموویان بەدیهاتوو و دروستکراون!

## یادخەرەوەی سێهەم

ئەی سەعیدی بێ ئاگا!

ئەو دنیایەی کە زۆر بە پەلـە دێـت و دەڕوات و لـەناودەچێت، کاتێ بۆی دەڕوانیت، بە ڕواڵەت وەك دنیایەك دێتـە بـەرچاوت کـە هـەرگیز تـامی مـردن نەچێژێت و هەتاهەتایە بۆ خۆی هەمیشەیی بێت..

ئەوەتا هـەر کاتێ سـەیری "ئاسۆکانی" دەوروبـەری خـۆت دەکـەیت، بـە شێوەیەکی گشتی و تا ڕادەیەك، لە بەرچاودا نەگۆڕ و دامەزراو دەردەکەون.

ئنجا کە ڕووی خۆت لەو ئاسۆیانە وەردەچەرخێنیت و ئـاوڕ لـە نـاوەوەی خـۆت دەدەیتـەوە و هـەر بـەم چـاوەش بۆ "دەروون"ی لـەناوچووی خۆیشـت دەڕوانیت، پێت وا دەبێت کە ئەویش - بە هەمان جۆر - نەجووڵ و نـەگۆڕ و دامەزراوە! لەمەوە وات لێ دێت کـە وا بزانیـت جگـە لـە سامی بـەرپابوونی قیامـەت هیـچ شتێك ئەم بۆچوونـە مەنگـەت لـێ ناشـڵەقێنێت، وەك بڵێـی تـا بەرپابوونی قیامەت بمێنیت!

نەخێر، بۆ خـۆت وریـا و ژیـر بـە و، هـەرگیز لـەو گومانـەدا مەبە! چونکـە خۆت و دنیا تایبەتی‌یەکەشت هەموو چرکەیەك لەسەر ڕێی گەشتی نەماندا بـە خێرایی هەنگاو دەنێن!

تۆ لەم هەستە هەڵەیەتدا وەك ئەو کەسە وایت کـە ئاوێنەیـەکی بـە دەسـتەوە بێـت و، ڕووەو کۆشـکێك، یـان شـارێك، یـان باخچەیـەك ئاوێنەکـەی ڕاگرتبێت و، بەم پێیە وێنەی ئەو کۆشکە یان ئەو شـارە یـاخود باخچەکـە لـە ئاوێنەکەی ئەودا دەرکەوتبێت..

جـا ئەگـەر بـە ئاستەم ئاوێنەکـەی دەستی بجووڵێـنرێت یـان بچووکـترین گۆڕانکـاریی تێـدا بکرێـت، ئـەوا - وەك ئاشـکرایە - وێنـەکانی نـاوی

دەلەرێنەوە و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت. لەو کاتەش مانەوە و نەبزوان و بەردەوامیی "خودی" کۆشك و شار و باخچەکە دادی تۆ نادات، چونکە تۆ تەنها ئەوەندەت لەو شار و کۆشك و باخچەیەدا هەیە کە ئاوێنەکەت - بەپێی توانا و لێهاتنی خۆی - پیشانتی دەدات!

کەواتە باش بزانە کە "ژیان" و "تەمەن"ت ئاوێنەن!

ئەم ژیانە پایە و، پشت و پەنا و، مەڵبەند و، ئاوێنەی دنیای تۆیە!

لەبەر ئەوە، تەنها لە دنیا تایبەتی‌یەکەی خۆت و شتانی ناوی ببڕ بکەرەوە و، بە وردی و خەستی سەرنج لەوە بدە کە هەموو خولەکێك دەگونجێ دنیاکەت برووخێت. واتە "ژیان"ت لە دۆخێکی وەهادایە کە هەموو خولەك و ساتێك لەوەدایە قیامەتی بەرپا ببێت!

مادەم "ڕاستی" وایە، ئەوا تۆیش ژیر بە و، کۆڵێك مەخەرە ئەستۆی ژیان و دنیاکەی خۆتەوە کە پێیان هەڵنەگیرێت!

## یادخەرەوەی چوارەم

بزانە!

یەکێك لە ڕەوێە و یاسا و کارە بەردەوامەکانی بەدیهێنەری دانا ئەوەیە کە:

زۆربەی جار "خودی" شتە بەنرخ و بایەخدارەکان - نەك هاوونەیان - سەرلەنوێ بەدیدەهێنێتەوە. دەبینیت لە کاتی ئاڵوگۆڕی وەرز و چەرخەکاندا شتان بە "هاوچەشنی خۆیان" دروست دەکاتەوە. بەڵام ئەو شتانەی کە دارای گرنگی و نرخ و بەهای تایبەتین، خودی خۆیان بەدیدەهێنێتەوە، نەك هاوچەشنیان!

گەر حەز دەکەیت لەم دەرەنجامە دڵنیا بیت، ئەوا فەرموو سەیری حەشری ڕۆژانە و ساڵانە و چەرخانە بکە، دەبینیت ئەم دەستوورە لە هەموو شتێکدا جێبەجێیە و بە ڕوونی دیار و بەردەوامە.

جا ئێمەش لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە دامەزراوە، دەڵێین:

هەموو زانستەکان لەوەدا یەکدەنگن کە مرۆڤ پێگەیشتووترین بەروبوومی درەختی بوونەوەران و، گرنگترین و بەنرخترین بەدیهێنراوە و، هەموو "یەکێك"ی لە حوکمی "جۆر"ی زیندەوەرانی تردایە..

لەبەر ئەوە، بە هەستێکی بێ گومان دەتوانرێت بوترێ کە:

(لە حەشر و زیندووبوونەوەی قیامەتدا، خودی هەموو یەکێکی مرۆڤ، بە خۆی و لەشولار و ناو و شێوەیەوە، زیندوو دەکرێتەوە و سەرلەنوێ وەك یەکەم جاری بەدی دەهێنرێتەوە).

## یادخەرەوەی پێنجەم

کاتێ "سەعیدی نوێ" ڕێی تێڕامان و بیرکردنەوەی گرتەبەر، گشت هونەر و زانستە فەلسەفییەکانی ئەورووپا کە تا ڕادەیەك لە بیری "سەعیدی کۆن"دا جێگیر بووبوون، لەناو دڵی ئەودا چەند نەخۆشییەکیان پێکهێنا و، لەو گەشتەی کە ئەو بە "دڵ" ئەنجامی دا چەندین گیروگرفتی زۆریان لێ پەیدا بوو.

لەبەر ئەوە، "سەعیدی نوێ" بیری خۆی - بە یەکجارەکی - لە چڵك و چەپەڵیی فەلسەفەی بە ڕووکەش ڕازاوە و شارستانێتیی ساختە و نەفام داتەکاند و، خۆی بە ناچار زانی لەغاو لە دەمی ئەو هەستە دەروونییانەی خۆی بنێت کە وان لە گیانیدا و لە بەرژەوەندیی ئەورووپا دەدوێن و پشتی دەگرن.

جا له‌م پێناوه‌دا، ئه‌م وتووێژه‌ی خواره‌وه‌ی له‌گه‌ڵ كه‌سێتیی مه‌عنه‌ویی ئه‌وروپادا ساز كرد. هه‌رچه‌ندەش ئه‌م وتووێژه‌ له‌ ڕوویه‌كه‌وه‌ كه‌م و كورت دیاره‌، به‌ڵام له‌ ڕوویه‌كی تره‌وه‌ به‌ دوور و درێژ داده‌نرێت.

جا بۆ ئه‌وه‌ی كه‌س به‌ هه‌ڵه‌ لێم تێنه‌گات، پێویسته‌ خوێنه‌ری به‌ڕێز له‌وه‌ ئاگادار بكه‌ینه‌وه‌ كه‌ "ئه‌وروپا" دوو ئه‌وروپایه‌:

یه‌كه‌میان: ئه‌و ئه‌وروپایه‌ی كه‌ به‌هۆی كه‌ڵك وه‌رگرتنی زۆری له‌ ئایینی مه‌سیحیی ڕاسته‌قینه‌، گه‌لێ سوودی به‌ مرۆڤایه‌تی گه‌یاند و چه‌ندین خزمه‌تیشی به‌ ژیانی كۆمه‌ڵایه‌تیی مرۆڤ پێشكه‌ش كرد، له‌ ڕێی ئه‌و زانست و پیشه‌سازی‌یانه‌ی كه‌ له‌سه‌ر بناغه‌ی ویژدان و دادگه‌ری دامه‌زراون و ئه‌و به‌ده‌ستی هێناون.

من له‌م وتووێژه‌مدا له‌گه‌ڵ ئه‌م به‌شه‌ی ئه‌وروپادا نادوێم، به‌ڵكو له‌گه‌ڵ:

به‌شی دووهه‌م: (یاخود ڕووی دووهه‌می ئه‌وروپا) ده‌دوێم. ئه‌و به‌شه‌ی كه‌ به‌هۆی فه‌لسه‌فه‌ی سروشتی و ماددی‌یه‌وه‌، به‌ ته‌واوه‌تی گه‌نیوه‌ و، خراپكاریی شارستانێتی‌یه‌كه‌ی به‌ چاكه‌ داده‌نێت و، له‌م ڕێیه‌وه‌ مرۆڤایه‌تیی به‌ره‌و نه‌فامی و گومڕایی و به‌دبه‌ختی داوه‌ته‌به‌ر!

له‌م گه‌شته‌ گیانی و مه‌عنه‌وی‌یه‌مدا، دوای ئه‌وه‌ی چاكه‌كاری‌یه‌كانی شارستانێتی و سووده‌ زانستی‌یه‌كانیم لێ جیا كرده‌وه‌، ڕووی ده‌می گوفتارم ئاراسته‌ی ئه‌و كه‌سێتی‌یه‌ی ئه‌وروپا كرد كه‌ فه‌لسه‌فه‌ی زیانبه‌خشی بێ نرخ و شارستانێتیی نه‌فام و بێ كه‌ڵكی به‌ده‌سته‌وه‌ گرتووه‌. پێم وت:

ئه‌ی ئه‌وروپای دووهه‌م!

گه‌ر نه‌تزانیوه‌، ئه‌وا باش بزانه‌ كه‌ تۆ به‌ ده‌ستی ڕاستت فه‌لسه‌فه‌ی ڕێ ونكه‌ری نه‌خۆش و، به‌ ده‌ستی چه‌پیشت شارستانێتیی زیانبه‌خش و نه‌فامت

هەڵگرتووە. پاشان لافی ئەوە لێ دەدەیت کە گوایا: "بەختەوەریی مرۆڤ لەو دوانەدایە"!

دەك دەستت بشکێت بۆ ئەو دیارییە بێ کەڵکەی پێشکەشی مرۆڤایەتیی دەکەیت! یاخوا هەر مایەی شوومی و هۆی نەهاتیی خۆت بێت.. هەروەك دەشبێت!

ئەی ئەو گیانە چەپەڵەی کە برەو بە بڵاوکردنەوەی کوفر و ئینکاری دەدات!

گەر مرۆڤێك گیان و ویژدان و دڵ و دەروونی پێکرابن، ئایا دەگونجێ کە تەنها بەوەی سامانێکی زۆر و ئارایشتێکی ڕواڵەتیی لەخشتەبەری دەست کەوتبێت، بەختەوەریی بەدەست هێنابێت؟

ئایا دەکرێ بەم جۆرە کەسانە بوترێت: "مرۆڤی بەختەوەر"؟

نابینیت گەر کەسێك لە کارێکی هەندەکی نائومێد بوو بێت و، لە هیوا و ئاواتێکی "وەهمی" دەستی داشۆردبێت و، لە هێنانەدیی کارێکی بێ بایەخیشدا ڕەنجەڕۆ بوو بێت، چۆن ئەو ئەندێشە بەتامەی لێ دەبێت بە ژەهری مار و، ئەو باروودۆخە نەرمونیانەی دەوروبەریشی ئازاری بەسۆی پێ دەچێژن و، ئەم دنیا بەرین و فراوانەی وەك بەندیخانە لێ دێتەوە یەك؟

ئەو کەسەی کە بەهۆی شوومیی تۆوە ناخی دڵ و گیانی پێکرابێت و، شەشدەری هەموو هیوا و ئاواتێکی لێ گیرابێت و، سەرجەم ئازارەکانی هاتنەوە سۆ، تۆ بۆ مرۆڤی بەدبەختی ئاوا چ بەختەوەرییەك دەتوانیت دەستەبەر بکەیت؟

ئەگەر کەسێك "دڵ" و "گیان"ی لە دۆزەخدا سزا بچێژن و، تەنها جەستەی لەناو بەهەشتێکی درۆینەی لەناوچوودا بێت، ئایا دەکرێ پێی بوترێت: "بەختەوەر"؟

ئەی ئەو گیانە چەپەڵە!

تۆ بە ڕێنماییەکانت وەها سەرت لە مرۆڤایەتی شێواند کە بە جارێ گرفتاری سەرکەشیت کرد، وا ئێستاش تاڵی و ئازاری ئەو دۆزەخە دەچێژێت کە تۆ لەناو ناز و نیعمەتی بەهەشتێکی درۆینەدا دەرخواردت دا.

ئەی دەروونی بەدخوازی مرۆڤایەتی!

سەرنج لەم نموونەیە بدە و ئنجا بزانە گرۆی ئادەمیزاد بەرەو کوێ دەبەیت:

وا دابنێ دوو ڕێگامان لە بەردەمدایە و، بەکێك لەو دوو ڕێگایەمان گرتەبەر. لە هەموو هەنگاوێکی ڕێی بەکەمدا چەندین هەژاری بێ دەستەڵات دەبینین کە ستەمکاران هێرشیان بۆ دەبەن و شمەك و سامانیان زەوت دەکەن و کەپر و خانووبەرەیان بەسەردا دەڕووخێنن. تەنانەت هێندە بە قووڵی جەستەیان زامدار دەکەن کە لە تاو سۆزی ئازارەکەیان تەنانەت ئاسمانەکانیش بەکوڵ بۆیان دەگرین! چاو بە هەر لایەکدا بگێڕێت و سەیری هەر شوێنێك بکرێت هەمان هەڵوێست و بارودۆخ دەبینرێت..

بەم جۆرە، ئەم ڕێیە جگە لە قرە و غەڵبەی ستەمکاران و، شیوەن و گریانی ستەم لێکراوان هیچی تری تێدا نابیسترێ. دەڵێی ماتەمینگایەکی گشتی لەسەر ئەم ڕێیەدا دانراوە!

خۆ مادەم مرۆڤیش – بەپێی خواستی مرۆڤایەتی‌یەکەی – هەردەم بە سزا و ئازاری کەسانی تر خەفەت دەخوات و ئازار دەچێژێت، ئەوا ناتوانێت بەرگەی ئازاری لە سنووربەدەری ئەم ڕێیە بگرێت! چونکە ویژدانی مرۆڤ هەڵگرتنی ئازاری تا ئەم ڕادەیەی لە تواناداا نی‌یە..

لەبەر ئەوە، هەر کەسێك ئەم ڕێیە دەگرێتەبەر ناچار دەبێت یەکێك لەم دوو چارەسەرە هەڵبژێرێت:

یـان خـۆی لـە مـرۆڤێتی داماڵێت و، دڵێکـی ڕەقـی بەردئاسـا لـەناو هەنـاویدا هەڵبگرێت و، نوقمی ئەوپەڕی دڕندەیی بێـت و، مـادەم خـۆی تەندروسـت و بێ وەی بێت ئیتر گوێ بە تیاچوونی کەسانی تـر نـەدات و خەمی ئازاری ئەوان نەچێژێت..

یاخود هەر شتێك "دڵ" و "ژیری"ی مرۆڤ داخوازی بن، ئەو وازیان لـێ بهێنێت و بە یەکجارەکی دەست لە هەموویان دابشوات!

دەسا ئەی ئەوروپای لادەر لە ئاینی ڕاستەقینەی "مەسیحی" و نوقم بـووی ناو لیتاوی گومڕایی و خراپکاری!

تۆ لـە پێشـدا بـە "فێڵبازیی یـەك چـاوەی دەجـاڵ ئاسـا" بـارێکی دژوار و نالەبارت بە گیانی مرۆڤ بەخشـی. پاشـان هەسـتت کـرد کـە ئـەو بـارەی تـۆ بۆت ڕەخسـاند - لـە ڕاستیدا - دەردێکی سـەختی بێ دەرمانـە، چونکـە لـە چلەپۆپەی بڵندترین بەرزییەوە مرۆڤ دەهاوێتە پلەیەکی گەلـێ نزمتر لـە هـی ئاژەڵیش!

ئنجـا هیـچ چارەسـەرێکیش بۆ ئـەم دەردە کوشـندە و زامـە ناسـۆرە شـك نابەیت جگە لە یاری و گەمە و لـەهوە سـەرنج ڕاکێشـەکانت (کـە هەسـت و نەستی ئادەمیزاد لەکار دەخەن و بە جۆرێکی کاتی بەنجی دەکەن) و، جگە لـە فەنتازییە ڕووکەش و، ئارەزووە خەوێنەرەکانت (کە پتر خەوی بێ ئاگایی لـە مرۆڤ دەخەن).

ئەمەیـە لـەو چارەسـەر و دەرمانـەی شـکی دەبـەیت! دەك بەدبـەختی و چارەشوومی هەر چارەنووسی خۆت و دەرمانت بێـت، ئـەو دەرمانـەی کـە - بە دڵنیایی - لە ئەنجامدا دەبێتە مایەی لەناوچوونی خۆیشت!

بەڵێ، ئەو ڕێیەی کە تۆ لە بەردەم مرۆڤدا کردووتـەوە، کتومـت، وەك ئـەم نموونەیە وایە.

بەڵام ڕێی دووهەم: ئەو دیارییەی قورئانی پیرۆزە کە پێشکەشی مرۆڤایەتیی کردووەو، لەوێوە بۆ ڕێی ڕاست ڕێنمایی کردوون.

ئێمە لە هەموو مەنزلگا و شوێن و شارێکی سەر ئەم ڕێیەدا چەندین سەربازی دەستپاك و گوێڕایەڵی پادشایەکی دادپەروەر دەبینین کە بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەتەوە و هەردەم لە کار و هاتوچۆدان.

جاربەجاریش هەندێ کەسی کارمەندی ئەو پادشا دادگەرە دێن و بە فەرمانی فەرمانڕەوای دادگەر هەندێ لەو سەربازانە لەسەر کار لادەبەن و چەك و وڵاخ و کەرەسەی سەربازیی سەر بە دەوڵەتیان لێ وەردەگرنەوە و، "بلیتی حەوانەوە"یان دەدەنێ.

ئەو سەربازانەش، بەم حەوانەوە و لەسەر کار لابردنە - لە ڕاستیدا - گەلێ شاد و دڵخۆشن، چونکە هەرچەند لە ڕواڵەتدا خەم بۆ لەدەستچوونی ئەو کەرەسە و پێداویستییانە دەخۆن کە لێیان سەندراوەتەوە، بەڵام دڵشادی ئەوەن کە کارەکەیان ئەنجام داوەو، وا ئێستا بەرەو خانە و مەڵبەندی پادشایەتی و بۆ مەبەستی شادمانیی ئامادەبوونیان لە خزمەت پادشادا، دەگەڕێنەوە.

هەندێ جار دەبینین ئەو کارمەندانەی پادشا بە سەربازی وا دەگەن کە ئەمان ناناسێت، کاتێ ئەمان پێی دەڵێن: چەکەکانت دابنێ.. ئەو بەکسەر دەڵێت:

"من سەربازی پادشای مەزنم و چاوەڕوانی فەرمانی ئەوم و لە خزمەتی ئەودا کار دەکەم و لە ئەنجامیشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە. ئێوە کێن وا دەتانەوێت ئەوەم لێ بسێنن کە پادشای مەزن پێی بەخشیوم؟ گەر بە فەرمان و ڕەزامەندیی ئەو هاتوون، ئەوا بەسەر چاو، فەرمانە بەرزە پیرۆزەکەیم پیشان بدەن. دەنا لەسەر ڕێم لاچن، خۆ گەر لانەچن ئەوا با من

تەنها یەك كەس و ئێوەش هەزاران بن، لەگەڵتاندا دەجەنگێم، چونكە من لەبەر خۆم ناجەنگم و موڵكی خۆم نیم، بەڵكو لە پێناوی پارێزگاری كردنی ئەمانەتی خاوەن و گەورەكەی خۆمدا و بۆ مەبەستی پاراستنی عیززەت و مەزنی‌یەكەی ئەو لەگەڵتان دەكەومە جەنگەوە. كەواتە هەرگیز ملتان بۆ كەچ ناكەم"!

ئەمە نموونەیەكی، یەك لە هەزاری، ئەو نموونانەیە كە لەم رێیەدا هەن و سەرچاوەی خۆشی و بەختەوەرین. ئیتر بۆ خۆت دەتوانیت نموونەی تری وەك ئەمە بدۆزیتەوە.

ئێمە بە درێژایی رێی دووهەم و ماوەی گەشت و سەفەر، خەڵكی دەبینین كە بەوپەڕی خۆشی و كامەرانی و شادمانی و بە جۆرێكی چڕ و بەردەوام دەكرێن بە سەرباز، مەبەست لەمەشدا ئەوانەن كە پێیان دەوترێت: "لە دایك بوان".. هەروەها لە هەمان كاتدا و بە هەمان خۆشی و لەگەڵ وتنی: "لا إله الا الله" و "الله اكبر"دا هەمیشە تەسریح بوونیش لە سەربازی بەردەوامە، كە بریتی‌یە لەوانەی پێیان دەوترێت: "كۆچكردوان".

ئەمەیە دیاریی قورئانی پیرۆز بۆ مرۆڤایەتی. هەركەسێ شوێنی بكەوێت لە هەردوو جیهاندا سەرفراز و بەختەوەر دەبێت و، بێ ئەوەی خەم بۆ شتێك بخوات كە لە دەستی چووبێت، یان پەژارەی رووداوی ئایندەی هەبێت، ئەم بە ئارامی و دڵنیایی رێی خۆی دەبڕێت، بە چەشنێ كە واتای ئەم ئایەتە پیرۆزەی تێدا دێتەدی كە دەفەرموێ:

﴿لا خَوْفٌ عليهم ولا هُمْ يَحْزَنون﴾[1].

ئەی ئەورووپای دووهەمی بێ كەڵكی خراپكار!

---

(١) (البقرة: ٢٦٢ و٢٧٤) ، (المائدة: ٦٩). گەلێ شوێنی تری قورئان. (وەرگێڕ)

تۆ پشتت بە چەند بناغەیەکی لاوازی کرمۆڵ بەستووە، ئەوەتا گومان وا دەبەیت کە گوایا:

(هەموو زیندەوەرێك، هەر لە مەزنترین مەلائیکەتەوە تا دەگاتە بچووکترین گیانلەبەری وەك ماسی، خۆی خاوەنی خۆیەتی و، تەنها بۆ خۆی و لە پێناوی خۆیدا کاردەکات و تێدەکۆشێت و، هەرچی کەسە تەنها بۆ تام و چێژی خۆی هەوڵ و تەقەلا دەدات و، هەر لەبەر ئەوەش مافی ژیانی هەیە. کەواتە ئەوپەڕی هیممەت و ئامانجی: مسۆگەر کردنی مانەوە و بەردەوامبوونی ژیانی خۆیەتی)!

پاشان ئەو "یاسای هاوکاری"یەی کە بۆ ئەنجامدانی فەرمانی بەدیهێنەری دانا لە نێوان بەدیهاتوواندا هەردەم دەست بەکارە و لە هەموو جێیەکی گەردووندا بە ئاشکرا لە بەرچاودایە، چەشنی "یارمەتیدانی ڕووەك بۆ ئاژەڵ و، ئاژەڵیش بۆ مرۆڤ"، تۆ ئەم یاسا خوایی و درەوشانەوە خاوەن کەرەم و میهرەبانی‌یەی کە لەو یارمەتی و هاوکاری‌یە گشتی‌یەوە پەیدا بوون، بە چاوی خۆت دەبینیت، کەچی پێت وایە ئەم یاسایە بریتی‌یە لە "مشتومڕ" و "ململانێ"! بە جۆرێکی وەها لەم هەڵەیەشدا ڕۆچوویت کە بڕیارێکی شێتانە دەردەکەیت و دەڵێیت:

"ژیان تێکڕا بریتی‌یە لە: مشتومڕ و ململانێ"!

قسەیەکی گەلێ سەیرە! چۆن ئەو فریاگوزاری‌یەی کە گەردیلەکانی خۆراك دەیکەن و بەوپەڕی تاسەمەندی و خۆشی‌یەوە بەدەم خانەکانی لەشەوە دەڕۆن و خۆراکیان دەرخوارد دەدەن، بە کاری مشتومڕ و ململانێ دادەنرێت؟!

نەخێر. بەهەڵەدا چوویت! ئەو کارە لە ڕاستیدا "یاسای هاوکاری"یە، کە تەنها بە فەرمانی پەروەردگارێکی گەورەی کارساز ئەنجام دەدرێت.

ئەو بناغەیەش کە پشتی پێ دەبەستیت و شتی لەسەر بنیات دەنێیت و لات وایە: "هەموو شتێك خاوەنی خۆیەتی"، بناغەیەکی فشەڵ و هەڵەیەکی گەلێ ئاشکرایە!

ڕوونترین بەڵگەش بۆ ئەمە: مرۆڤە؛ ئەوەتا لە نێوان سەرجەمی هۆکارەکاندا مرۆڤ بەرزترینیانە و خاوەنی فراوانترین ویست و ئیختیارە، کەچی دەبینین لەناو دەستی ویست و ئیختیاری مرۆڤ و بازنەی توانایدا و لەو کردەوانەیدا کە بە ویست و ئیختیاری خۆی ئەنجامیان دەدات - وەك خواردن و خواردنەوە و بیرکردنەوە - بەشێکی تەماویی یەك لە سەد نەبێت هیچی تری بە دەستی خۆی نییە!

جا کەسێك کە لەم کارە ئاشکرایەدا لە سەدا یەك زیاتری لە توانادا نەبێت، چۆن بە خاوەنی خۆی دادەنرێت؟!

لە کاتێکدا بەڕێزترین "هۆکار" و فراوانترین "ویست و ئیختیار" ئاوا دەستی بەسترابێت و، خاوەنی موڵکدارییی ڕاستەقینە و هەڵسوکەوتی سەربەخۆی تەواو نەبێت، دەبێ چی سەبارەت بە ئاژەڵ و بێ گیانەکانەوە بوترێت؟

ئایا کەسێك وتەی ئاوای بە جۆرێکی هەرەمەکی و بێ پەروا لە زار دەربچێت، لە ئاژەڵ گومڕاتر و لە بیانییەکانیش بێ هەست وشعوورتر نییە؟!

دەسا ئەی ئەورووپا!

تەنها فێڵبازیی یەکچاوەتە - کە زیرەکییە لەڕادەبەدەر شوومەکەتە - تۆی گرفتاری ئەم گێژاوە کردووە. ئەوەتا بەهۆی ئەم زیرەکییە شوومەت، پەروەردگار و بەدیهێنەری هەموو شتێکت لە یاد چووە و، ئاسەوار و جێدەستە ناوازە و بێ وێنەکانی ئەوت داوەتە پاڵ هۆکارەکان و، سروشتی

دەست هەڵبەستی خەیاڵ. ئنجا موڵکی ئەو بەدیهێنەرەشت بەسەر ئەو "بتانەی" کە جگە لە خوای گەورە دەپەرستڕێن، دابەش کرد.

لە گۆشە نیگای ئەم زیرەکی‌یە یەك چاوەی تۆوە، هەموو زیندەوەرێك ناچار دەبێت، هەر بە تەنها خۆی، لەگەڵ چەندین دوژمنی لەژمارەبەدەردا بکەوێتە ململانێ و، هەر تەنها خۆیشی پێداویستی‌یە لەسنوور بەدەرەکانی پەیدا بکات..

هەموو ئەمانەش تەنها لە ڕێی تواناکەی خۆیەوە کە بە ئەندازەی گەردیلەیەکە و، بە ویست و ئیختیاریشی کە چەشنی تاڵە موویەکە و، بەو هەست و نەست و شعوورەی کە وەك بریسکەیەك وایە و یەکسەر نامێنێت و، بەو ژیانەی کە لە بڵێسەیەك دەچێت؛ لە پڕ دەکوژێتەوە و، لەو تەمەنەشدا کە دەڵێی یەك خولەك ماوەیەتی و کتوپڕ تەواو دەبێت. لە کاتێکدا هەرچی‌یەکی لە دەستدایە بەشی هێنانەدی یەکێك لە داواکاری‌یەکانی ناکات، بە ڕادەیەکی وا کە ئەگەر دووچاری گیروگرفتێك بێت، بە چەند هۆکارێکی کەڕوکاس نەبێت هیوای بە هیچ دەرمانێکی تر نی‌یە و، بە تەواوی ناوەرۆکی ئەم ئایەتەی تێدا دێتەدی کە دەفەرموێ:

﴿وما دُعاءُ الْكافرينَ إلاّ في ضَلالٍ﴾ (الرعد:١٤)!

ئەم فێڵبازی و زیرەکی‌یە ڕەش و تارەت، ڕۆژگاری مرۆڤایەتیی گۆڕیوە بە شەوگارێکی تاریکی پڕ لە ستەمکاری. پاشان دەتەوێت بە چەند چرایەکی درۆینە و کاتی ئەو تاریکی‌یە سامناکە بڕەوێنیتەوە و دنیا ڕووناك بکەیتەوە!

بەڵام باش بزانە ئەو چرایانەی کە تۆ دایاندەگیرسێنیت هەرگیز لە ڕووی مرۆڤدا ڕووناکیی خەندە و دڵنەوایی نانوێنن، بەڵکو بە چاوی سووکایەتی و گاڵتەجاڕی بۆی دەڕوانن، بە تایبەت لەو کاتانەدا کە مرۆڤ نوقمی لیتاوی

چەندین باری ئازاربەخشی گریان ئامێزە و لەتاوا - شێتانە - قاقا لێ دەدات!

لە ڕوانگەی بینینی قوتابییەکانی تۆوە هەموو زیندەوەرێك هەژارە و دووچاری چەندین گیروگرفتی ئەوتۆیە کە هەر هەموویان ئەنجامی هێرش و پەلاماری ستەمکارانە لەسەریان.

دنیا لە ڕوانگەی ئەودا ماتەمینگایەکی گشتییە و، ئەو دەنگانەش کە لێی دەبیستڕێن هەواڵی مردن و، ئاخ و ئۆفی ئازار و، ناڵە و گریانی هەتیوانە.

هەر کەسێك ئامۆژگاری لە تۆ وەردەگرێت و ڕەفتار بە ڕێنماییەکانت دەکات، لە ئەنجامدا دەبێت بە "فیرعەونێکی ستەمکار" بەڵام لە هەمان کاتدا فیرعەونێکی ڕسوا و زەلیل! چونکە بێ نرخترین شت دەپەرستێت و هەرچی سوودی لێ ببینێت بە پەروەردگاری خۆی دایدەنێت!

هەر ئەم قوتابییەت، قوتابییەکی "سەرکەش"ە، بەڵام سەرکەشێکی هەژار؛ چونکە لە پێناوی بەدەستهێنانی لەزەتێکی بێ بایەخدا قاچی شەیتانیش ماچ دەکات و، لەبەر دەستکەوتنی سوودێکی نزمیش بەوپەڕی زەلیلی ڕازی دەبێت!

ئەم قوتابییەت گەلێ بە زەبروزەنگە، بەڵام خاوەن زەبرێکی وەهایە کە تابلێی کۆڵەوارە. چونکە لەناو دڵی خۆیدا هیچ پاڵپشتێك شك نابات پاڵی پێوە بدات.

لەوپەڕی ئاوات و هیممەتی بەرزی قوتابیی تۆ لەوەدایە کە: "هەوا و ئارەزووەکانی خۆی" تێر و دڵنیا بکات، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە ساختە و فێڵیشی بۆ بەکاردەهێنێت! چونکە لە ژێر پەردەی لافی میللەتپەروەری و قوربانی و خۆبەختکردندا بە دوای سوود و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیدا دەگەڕێت!

بەم چەشنە فێڵ و تەڵەکەبازی‌یانەش هەڵپە و تەماع و غرووری ناخی خۆی تیژ دەکات. چونکە - لە ڕاستیدا - جگە لە خۆی کەسی تری خۆش ناوێت، تەنانەت لە پێناوی خۆیدا هەموو شتێکی تر بەخت دەکات!

بەڵام قوتابیی دڵسۆز و بێگەردی قورئانی پیرۆز "بەندە"یە. بەندەیەکی وا کە سەری بەندایەتی بۆ مەزنترین بەدیهێنراویش دانانەوێنێت. کەواتە "بەندەیەکی خاوەن عیززەتە" و، هەرگیز بەوە ڕازی نابێت کە نیعمەتی هەرە مەزنی بەهەشتیش ئامانج و مەبەستی خواپەرستیی بێت..

هەر ئەم قوتابی‌یەی قورئان "لەسەرخۆ و نەرمونیان"ە، بەڵام جگە لە بەدیهێنەری مەزنی خۆی و بۆ غەیری فەرمانەکانی ئەو، لە ڕووی کەسدا زەلیلی نانوێنێت! کەواتە خاوەنی هیممەتێکی بەرز و ویستێکی ڕاستە..

ئنجا ئەم قوتابی‌یە: "هەژار"ە، بەڵام لەبەر ئەو پاداشتە زۆرەی کە خاوەنە میهرەبانەکەی بۆی پاشەکەوت کردووە، پێویستی بە هیچ شتێك نی‌یە و، لە ڕووی کەسدا دەست ناگرێتەوە..

پاشان "لاواز"ە، بەڵام پاڵی بە هێزی خاوەنە گەورەکەی خۆیەوە داوە. کەواتە قوتابیی خاوێن و بێگەردی قورئانی پیرۆز ڕازی نابێت بەهەشتی هەمیشەییش ئامانجی بێت، چ جای ئەم دنیا فانی‌یە!

بۆ خۆت لەم بەراوردەوە مەودای ئەو جیاوازی‌یە مەزن و فراوانە تێبگە کە لە نێوان هیممەتی ئەو دوو قوتابی‌یەدا هەن!

هەر بە هەمان جۆر، دەتوانن لە ڕووی دەرکەوتنی "ڕادەی خۆبەختکاری"ی هەردووکیانەوە، جیاوازیی نێوان شاگردانی فەلسەفەی نەخۆش و قوتابیانی قورئانی پیرۆز لێکبدەنەوە:

ئەوەتا قوتابیی فەلسەفە لە پێناوی بەرژەوەندیی خۆیدا، لە براکەی هەڵدێت و دەعوای لەسەر تۆمار دەکات!

بەڵام قوتابیی قورئان، سەرجەمی بەندە ڕاست و چاکەکانی خوای گەورە، کە لەناو زەوی و ئاسمانەکاندان، تێکڕا بە برای خۆی دەزانێت و لە ناخی گیانی خۆیدا هەست بە چەندەها پەیوەندی و تاسەمەندی دەکات بەرامبەریان.

لەبەر ئەوە، هەمیشە لە قووڵایی دڵی خۆیدا نزای گەرموگوڕی بێگەردیان بۆ دەکات و، بە بەختیاریی ئەوان هەمیشە بەختەوەر دەبێت..

کە دەشڕوانێتە گەردوون، مەزنترین شتی وەك عەرش و خۆری مەزنی ئاسمانیش، بە بەندەی گوێڕایەڵ و کار پێ سپێرراوی خوای گەورەیان دادەنێت.

ئنجا دەتوانیت بەمەی خوارەوە، ئەندازەی بەرزبوونەوە و فراوانیی "گیان"ت لە لای ئەو دوو قوتابییە بۆ دەربکەوێت:

قورئانی پیرۆز - بە چەشنێکی بەرز - ڕوونی و فراوانی و بەربڵاوی بە "گیان"ی قوتابیانی خۆی دەبەخشێت. چونکە لە بریی نەوەد و نۆ دەنکی تەسبێح، زنجیرەیەکی پێکهاتوو لە نەوەد و نۆ جیهانیان لە جیهانەکانی گەردوون دەداتە دەست، کە نەوەد و نۆ ناوی جوانی خوای گەورەیان تێدا دەدرەوشێتەوە و، پێیان دەڵێت:

"فەرموون زیکر و ویردەکانتان بەم زنجیرە و تەسبێحە مەزنە بخوێنن".

ئەوانیش بەو تەسبێحە سەرسووڕهێنەرە ویردەکانیان دەخوێنن و، بە ژمارە بێ سنوورەکانیشی یاد و زیکری پەروەردگاری خۆیان دەکەن.

ئەگەر حەز دەکەیت ئەمەت بۆ دەربکەوێت، ئەوا فەرموو سەیری "ئەولیا و پیاوچاکان"ی قوتابیانی قورئان بکە، وەك: (شێخی گەیلانی[1] و، ڕەفاعی[2] و، شازلی[3]، خوایان لێ ڕازی بێت) کاتێ کە ئەوان ویردەکانیان دەخوێنن گوێیان لێ ڕابگرە و بزانە چۆن زنجیرەی گەردیلەکان و ژمارەی

(١) شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە سالی (٤٧٠ ك) لە گەیلان هاتووەتە دنیا و، لە نەوەی حەزرەتی حەسەنە. بۆ خوێندن ڕۆیشتووە بۆ بەغدا و سەرجەمی زانستە ئیسلامی‌یەکانی ئەو ڕۆژگارەی لای زانایانی پایە بەرزی بەغدا خوێندووە. یەکێکە لە گەورە خزمەتگوزارانی ئاینی ئیسلام و، چەندەها کەس لە گاور و جوولەکەکان لە خزمەتیدا موسلمان بوون و هەزاران موسلمانیش لەسەر دەستیدا تۆبەیان کردووە و دەستبەرداری کردەوە خراپەکان بوون. چەند کتێبێکی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە وەك (الغنية) و (فتوح الغيب) و (الفتح الربـــــاني). لە سالی (٥٦١ك) لە تەمەنی نەوەد سالیدا کۆچی دوایی کردووە و لە قوتابخانەکەی خۆی لە بەغدا نێژراوە. بۆ مەبەستی ناسینی پایەبەرزیی ئەم مەردە مەزنە و ئاشنا بوون بە ڕۆلی کاریگەری لە مێژووی ئیسلامدا، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو فەسلانە دەکەین کە مامۆستای مێژوونووسی هاوچەرخ (أبو الحسن الندوي) خوا لێی خۆش بێت، لە بەرگی یەکەمی (رجال الفكر والدعـــوة في الإسلام)دا تۆماری کردوون، هەروەها کتێبی: (هكذا ظهر جيل صلاح الدين وهكذا عادت القدس) نووسینی: (د. ماجد عرسان الكيلاني) بە تایبەت (الفصل الحـــادي عشـــر: مـــدارس الإصلاح والتجديد، المدرسة القادرية). (وەرگێڕ)

(٢) سەید ئەحمەدی ڕەفاعی: ناوی تەواوەتی: ئەحمەدی کوڕی عەلیی کوڕی یەحیای ڕەفاعی‌یە. سالی (٥١٢ك) لە گوندێکی سەر بە شاری "واسط"ی عێراق لەدایك بووە و، هەر لەو شارەشدا وانەکانی خوێندووە و، لە ئەدەب و فیقهدا شارەزایی پەیدا کردووە. لە گوندی "ئوم عوبەیدە" لە نێوان واســط و بەسرەدا ژیاوە. سالی (٥٧٨ك) کۆچی دوایی کردووە. پێشەوایەکی زاهید بووە و دامەزرێنەری تەریقەتی ڕەفاعی‌یە. بڕوانە: الأعلام ١/١٧٤، جـــامع كرامات الأولياء ٢/٤٩٠، نور الأبصار ٢٢٠، الطبقات الكبرى ١/١٤٠، وفيـــات الأعيـــان ١/٥٥. (وەرگێڕ)

(٣) شازلی: ناوی تەواوەتی: "عەلیی کوڕی عەبدوللای کوڕی عەبدولجەبار"ە و، لە سالی (٥٩١ك) لە گوندێکی ئەفریقیا بەناوی "شـــاذلة" لە دایك بووە. پێشەوایەکی زاهید و شێخی تەریقەتی شاذلی و دانیشتووی "ئەسکەندەریە"ی میسر بووە و، خاوەنی ئەو کۆمەڵە ویردەیە کە بە: "حزب الشاذلي" ناسراوە. بڕوانە: الأعلام ٤/٣٠٥، جامع كرامات الأولياء ٢/٣٤١، نـــور الأبصار ٢٣٤. الطبقات الكبرى ٢/٤. (وەرگێڕ)

دڵۆپە ئاوەکان و هەناسەی بوونەوەرانیان کردووە بە تەسبێحی خۆیان و، تەقدیس و یاد و زیکری خوای گەورەی پێ دەکەن!

بە وردی سەرنج بدە چۆن ئەم مرۆڤە لاوازە بچووکەی کە بچووکترین میکرۆب زۆرانی لەگەڵ دەگرێ و، کەمترین تەنگانەش تەختی زەویی دەکات، چۆن لە ڕێی پەروەردەی ئاوازەی قورئانەوە بەرز دەبێتەوە و، هەموو لایەنە ناسك و نیانەکانی فراوانی و بەربلاوی بەدەست دەهێنن و، بەهۆی ڕێژنەی ڕێنماییەکانی قورئانەوە پڕ دەدرەوشێنەوە، بە ڕادەیەك کە مەزنترینی بوونەوەرانی دنیای گەلێ پێ بچووکترە لەوەی بیکات بە تەسبێحی وێردەکانی، تەنانەت بەهەشتی مەزنیشی پێ کەمترە لەوەی بیکات بە ئامانجی زیکرەکانی کە یادی خوای گەورەیان پێ دەکات!

کەواتە لەم قوتابییەی قورئان، لەوپەڕی "لەخۆبوردەیی" لە نێوان لەوپەڕی "عیززەت"دا کۆکردووەتەوە!

بەم جۆرە، دەتوانیت مەودای ئەو دواکەوتن و نزمییەت بۆ دەربکەوێت کە قوتابیانی فەلسەفە تێی کەوتوون.

بەم چەشنە دەرکەوت کە هەموو ئەو "ڕاستی"یانەی فەلسەفەی نەخۆشی ئەورووپا لە ڕێی "زیرەکیی یەك چاوەی" خۆیەوە بە چەند شتێکی قەڵب و شێواویان دەبینێت، ڕێنمایی قورئانی پیرۆز بە ڕوونی و لەسەر شێوەی ڕاستەقینەیان دەیانبینێت. چونکە ڕێنمایی قورئان ڕووناکییەکی وایە کە لە یەك کاتدا بە دوو دانە چاوی ڕوون و تیژی غەیب‌بین بۆ هەردوو جیهانی ئەم دنیا و ئەودنیا دەڕوانێت و بە هەردوو دەستیشی ئاماژە بۆ بەختەوەرییەکانی هەردوو دنیا دەکات و، بە گرۆی مرۆڤ دەڵێت:

ئەی کاکی مرۆڤ! نە خۆت و نە سامانت هیچیان موڵکی تۆ نین، بەڵکو هەردووك سپاردەن و لای تۆ دانراون.

خاوەنی ئەو سپاردەیەش توانای هەموو شتێکی هەیە و ئاگاداری هەموو کارێکە و بەخشندە و میهرەبانە. ئەو موڵکەی خۆی - کە بە سپاردە لای تۆ دایناوە - دەیکڕێتەوە لێت، تاکو نەفەوتێ و هەڵی بگرێت بۆت و بیپارێزێت. نرخێکی گەلێ گەورە و زۆریشت لە بریی ئەوەدا دەداتێ.

تۆ جگە لە سەربازێکی کار پێ سپێرراوی ئەو شتێکی تر نیت. کەواتە لەبەر ئەو خاوەنەت و لە پێناویدا کارەکانت جێبەجێ بکە. ئەوەتا هەر ڕۆژێیەکت پێویست بێت هەر ئەو دەینێرێت بۆت و، هەر ئەویشە کە لەو گیروگرفت و دوژمنانەت دەتپارێزێت کە دەسەڵاتت بەسەریاندا ناشکێت و بۆ خۆت ناتوانیت ڕووبەڕوویان ببیتەوە!

ئامانج و ئەنجامی ئەم ژیانەت بریتی‌یە لەوەی کە جێی دەرەوشانەوەی ناوەکانی خاوەنەکەت و تیشکدەرەوەی کاروبارە پڕ لە دانستەکانی ئەو بێت. خۆ هەر کات دووچاری هەر گیروگرفتێك بوویت، پێی بڵێ:

﴿إِنَّا للهِ وإِنَّا إِلَيْهِ راجِعُونَ﴾ (البقرة:١٥٦).

واتە من گوێڕایەڵی فەرمانی خاوەنەکەی خۆمم. تۆش - ئەی گیروگرفتەکە! - گەر بە ڕوخسەت و ناوی خاوەنەکەمەوە هاتوویت، بەخێربێیت سەرچاوان! چونکە ئێمە - بێ چەند و چۆن - بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە و شەرەفمەندی ئامادەبوونی خزمەتی ئەو دەبین.

لە ڕاستیدا ئێمە گەلێ تامەزرۆ و ئارەزوومەندی شادبوونی دیداری ئەوین. مادەم ئەو خاوەنەمان ڕۆژێك لە ڕۆژان لەدەست ئەرکەکانی ژیان ڕزگارمان دەکات، دەبا ئێستا ڕزگاربوونمان لەسەر دەستی تۆدا بێت، من ئامادە و ملکەچ و ڕازیم.

خۆ ئەگەر فەرمان و ویستی خوای گەورە بۆ ئەوە دەرچوویێت لەسەر دەستی تۆدا تاقی بکرێمەوە و دەربکەوێت تا چەندە پارێزگاریی سپاردەکەی

ئەستۆم دەکەم و تا چ ڕادەیەکیش ئەرکی سەرشانم جێبەجێ دەکەم، ئەوا باش بزانە کە من تا دەتوانم سپاردەی خاوەنەکەم دەپارێزم و بە هیچ دەستێکی ناسپێرم کە جێی بڕوا و متمانەم نەبێت و، بە فەرمان و ڕەزامەندیی ئەو نەبێت من هەرگیز بۆ هیچ کەسێك مل کەچ ناکەم!

ئەمە نموونەیەك بوو لە نێوان هەزاراندا، بۆ دەرخستنی نرخی ئەو دەرسەی کە زیرەکیی فەلسەفە دەیلێتەوە و.. ئەو پلەوپایە بەرزەش کە وانەکانی قورئانی پیرۆز ڕێنمایی مرۆڤیان بۆ لا دەکەن.

بەڵێ، باری ڕاستەقینەی هەردوو لا لەسەر ئەم تەرح و تەرزەن کە باسمان کردن.

ئەوەندە هەیە کە پلەکانی خەڵکی لە "هیدایەت و گومڕایی.. ئاگاداری و بێ ئاگایی"دا وەکو یەك نین و، هەموو کەسێك لە هەموو پلەیەکدا بە ڕوونی هەست بەم ڕاستییە ناکات. چونکە "بێ ئاگایی" هەست و نەستی مرۆڤ بە تەواوی لە کار دەخات و بەنجی دەکات.

خۆ لەم ڕۆژگارەدا بە ڕادەیەك هەست و شعووری خەڵکیی لەکار خستووە کە تەنانەت ئەو کەسانەش شوێن پێی شارستانێتیی نوێیان هەڵگرتووە، هەست بە ئازار و تامی تاڵی ئەم ئەشکەنجە سەختەی گومڕایی ناکەن. بەڵام - پشت بە خوا - بە زێدە زۆربوونی هەستی زانستی و پەی بردن بە نرخ و بەهای زانیاری، ئەم پەردەی بێ ئاگایی و بەنج بوونی هەستە دەدڕێت، جگە لە هەڕەشەی "مردن"یش کە هۆکارێکی ترە بۆ ئەم بێداربوونەوەیە و هەرچی ڕۆژە لە بەرچاوی مرۆڤایەتیدا تەرمی سی هەزار کەس بەڕێ دەکات!

دەسا داخ و حەسرەت و زەرەرمەندی بۆ ئەو کەسەی کە بە "بت"ی بیانییەکان و زانستە ماددییە سروشتییەکانی ئەوان لە ڕێ دەرچووە و،

شوێنیان کەوتووە و بست بە بست - کوێرانە - هەنگاویان بە دوادا دەنێت و لاسایی هەڵسوکەوتیان دەکاتەوە!

ئەی ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانە!

هەرگیز هەوڵ نەدەن چاو لە فەرەنگ بکەن! ئایا دوای ئەو هەموو ستەمە ناڕەوا و دوژمنایەتی‌یە سەختەی کە لە ئەورووپاوە بینیتان، هێشتا هەر لە گومڕاییاندا چاویان لێ دەکەن و بە شوێن پێی بیرە بەتاڵەکانیاندا هەنگاو دەنێن و، بێ ئەوەی بە خۆتان بزانن دەچنە ژێر ئاڵاکەیانەوە؟!

ئێوە بەم کارەتان بڕیاری "لە سێدارەدانی هەمیشەیی" بۆ خۆتان و براکانتان دەردەکەن.

کەواتە وریا و ژیر بن! هەتا ئێوە لە گومڕایی و نەفامی‌یاندا لاساییان بکەنەوە و شوێن پێیان هەڵبگرن، لە لاف لێدانی میللەتپەروەری و خۆبەختکاریدا درۆزنتر دەردەچن! چونکە شوێنکەوتنی ئەوان - لە ڕاستیدا - سووکایەتی و گاڵتەکردنە بە نەتەوەکەی خۆتان.

لە خوا داواکارم ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا ڕێنمایی ڕێی ڕاست بکات.

## یادخەرەوەی شەشەم

ئەی ئەو کەسەی لە ناو زۆریی ژمارەی کافران گرفتاری دڵتەنگی و نیگەرانی دەبێت! ئەی ئەو کەسەی بە یەکگرتنی ئەو کافرانە لەسەر ئینکاری کردنی هەندێ "ڕاستیی ئیمان" هەڵوێستی لەق دەبێت!

کاکی هەژار! بزانە کە:

یەکەم:

نرخ و گرنگی لە "زۆریی ژمارە" و "چەندایەتی"دا نی‌یە. چونکە مرۆڤ گەر مرۆڤێکی ڕاستەقینە نەبێت، ئەوا دەبێت بە ئاژەڵێکی ڕاستەقینە!

ئەوەتا مرۆڤ هەتا زیاتر لە هاندەرە ئاژەڵییەکاندا ڕۆبچێت، پتر لە ئاژەڵەکان ئاژەڵێتی بەدەست دەهێنێت، وەك هەندێ لە بیانییەکان و ئەوانەش کە شوێن پێیان هەڵدەگرن! جا لە کاتێکدا کەمیی ژمارەی مرۆڤ لە چاو زۆریی ژمارەی ئاژەڵدا بە چاوی خۆت دەبینیت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەبینیت ئەم مرۆڤە بووە بە پادشا و سەرداری هەموو جۆرەکانی زیندەوەران و جێنشینی سەر ڕووی زەوی.

کەواتە ئەو کافرانەی ئینکاریی ئیمان دەکەن و ئەو کەسانەش کە لە هەرزەییدا چاویان لێ دەکەن، جۆرێکی چەپەڵن لەو ئاژەڵانەی کە خوای گەورە بۆ ئاوەدان کردنەوەی دنیا بەدیی‌هێناون و، کردوونی بە "یەکەیەکی پێوانە" بۆ مەبەستی ناسینی پلەی ئەو نیعمەتانەی کە بە بەندە ئیماندارەکانی خۆی بەخشیون! خۆ کاتێکیش کە سەرزەوی و هەرچییەکی تێدایە بۆ خوای گەورە دەمێنێتەوە و ڕۆژی دوایی دێتە کایەوە، خوای گەورە هەموو ئەوانە بە دۆزەخ و ئەنجامێك دەسپێرێت کە شایستەیانن.

دووەمەم:

ئینکاری کردنی کافران و گومڕایان بۆ هەر ڕاستییەکی ئیمان، هەڵوێستێکی بێ هێزە و، نەفی کردنیشیان بۆ ئەو بابەتانە کارێکی بێ پاڵپشتە و، یەکگرتنیشیان هیچ گرنگی و نرخێکی نییە!

چونکە کار و هەڵوێستەکەیان بریتییە لە "نەفی کردن". خۆ نەفی کردنی هەزار کەسیش وەك هی یەك کەس وایە؛ هیچ نرخێکی بۆ دانانرێت!

نموونەی ئەمە، وەك ئەوەی کە ئەگەر لە سەرەتای مانگی ڕەمەزاندا هەموو دانیشتووانی ئەستەمبوول "نەفی"ی بینینی مانگ بکەن و بڵێن: نەماندیوە، ئەوا شایەتیی تەنها دوو کەسی چەسپێنەر هیچ بایەخێك بۆ یەکگرتنی قسەی ئەو کۆمەڵە هەرە زۆرە ناهێڵێتەوە!

لەم نموونەیەوە تێدەگەین کە مادەم ڕاستی و چییەتیی "کوفر" بریتی‌یە لە "نەفی و ئینکاری و نەزانی و نەبوون" ئەوا یەکگرتنی کافرە زۆر و زەبەندەکان لەسەر کوفرەکەیان هیچ نرخێکی نی‌یە! هەر لەبەر ئەوەشە لە بابەتەکانی ئیماندا - کە بە تەواوی و بێ گومانی چەسپاون - بڕیاری تەنها دوو کەسی ئیماندار (کە لەو بابەتانەدا پشت بە بینین دەبەستن) بەسەر یەکگرتنی چەندەها کەسی لەژمارەبەدەری گومڕا و ئینکار و ملنەدەردا پێش دەخرێت و، قسەی ئەمان بەسەر هی ئەواندا زاڵ دەکرێت!

ئەو نهێنی‌یەی کە لەم ڕاستی‌یەدا هەیە، بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

دەعوای "نەفی‌کەران" هەرچەند لە ڕوالەتدا بە یەك دەعوا دیارە، بەلام لە ڕاستیدا بریتی‌یە لە چەندین دەعوای جیا جیا و، هیچیشیان لە یەکێکی تریان ناچێت تاکو ببن بە یەك و پشتی ئەوانی تر بگرێت و بەهێزیان بکات. چونکە ئەو کەسەی کە مانگی یەك شەوە بە ئاسمانەوە نابینێت، دەڵێت: "من مانگ نابینم" یان "پێم وایە مانگ بە ئاسمانەوە دیار نی‌یە". هەروەها ئەوانی تریش هەمان گوفتار دووپات دەکەنەوە. واتە هەریەکەیان لە گۆشەی ڕوانینی تایبەتیی خۆیەوە نەفیی هەڵهاتنی مانگ دەکات، نەك لە واقیعی حاڵ و خودی نەبوونی مانگ - لە ڕاستیدا - بە ئاسمانەوە!

ئیتر جیاوازیی ڕوانینی هەریەکەیان لە چاو ئەوانی تردا و، جۆراوجۆریی ئەو هۆکارانەش کە دەبنە پەردەی نەبینین و، جیابوونی ڕێگری بینین لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر.. هەموو ئەمانە، کارێك دەکەن کە دەعواکانیان جیاواز و جۆراوجۆر دەربچێت و هیچ کامیان پشتی ئەوانی تر نەگرێت!

بەلام هیچ کام لە "چەسپێنەران" نالێت: بەپێی بینینی من. یان: لام وایە مانگ بە ئاسمانەوەیە. نەخێر، وا نالێت. بەڵکو دەڵێت: "لە ڕاستیدا مانگ

لەوەتا بە ئاسمانەوە". ئنجا گشت بینەرانی تریش لەم دەعوایەدا تەسدیقی دەکەن و لە هەمان بینیندا پشتی دەگرن و، بە یەکدەنگ دەڵێن: "لە ڕاستیدا مانگی یەك شەوە هەڵهاتووە". واتە دەعوای هەموویان هەر یەك دەعوایە.

جا لەبەر ئەوەی ڕوانینی "نەفی کەران" جۆراوجۆرە، ئەوا دەعواکانیشیان لە یەکتر جیاوازە و، حوکمی هیچیان خودی شتە نەفی کراوەکە ناگرێتەوە و، لە ڕاستیدا "نەفی" هەرگیز بە هیچ کەسێك ناچەسپێنرێت. چونکە ئەم کارە داخوازی بوونی زانینێکی گشتی و هەمەلایەنگیر دەبێت!

هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەم دەستوورەی خوارەوە کراوە بە یەکێك لە قاعیدە و یاساکانی زانستی "ئوصوولی دین" کە دەڵێت:

"العدم المطلق لا يُثبَتُ إلاّ بمشكلات عظيمة"[1].

بەڵێ، گەر سەبارەت بە هەر شتێکی ناو ئەم دنیایە بڵێیت: لەو شتە "هەیە"، ئەوا تەنها پیشاندانی ئەو شتە سەروزیادە بۆ چەسپاندنی "بوون"ی.. بەڵام گەر "نەفی"ی بوونی ئەو شتەت کرد، دەبێ بۆ چەسپاندنی ئەو "نەفی"یە یان ئەو "نەبوون"ە گشت لایەکی دنیا بگەڕێیت و هەموو گۆشەیەکیشی بپشکنیت و ئنجا هاودەم لەگەڵ ئەم گەڕان و پشکنینەدا پیشانی خەڵکیشیان بدەیت کە شتی وایان تێدا نییە!

بە ڕوونبوونەوەی ئەم نهێنییە، دەردەکەوێت کە هەزار کافر و یەك دانە کافر لە ئینکاری و نەفی کردنی هەر ڕاستییەکی ئیماندا یەکسانن. چونکە زۆرییەکەیان دادیان نادات و پشتگیریی یەکتریی لێ دروست نابێت! ئەو هەڵوێستەی ئەوان کتومت وەك حەلکردنی مەسەلەیەك وایە کە بە زەین

---

(١) واتە: هەرشتێك بە چەشنێکی ڕەها بە "نەبوو" دابنرێت، مەگەر بە چەندین گیروگرفتی سەخت دەنا هەرگیز ناکرێ بچەسپێنرێت. (وەرگێڕ)

لێکبدرێتەوە و، وەك تێپەڕبوونە بە ناو کونێکی بچووکدا و، چەشنی بازدانە بەسەر چاڵێکی فراوان و مەزندا! کە ئەمانە چەند کردارێکن هەرگیز زۆربەی بەشداربووان سوود بە ئاسانکردنی بابەتەکە ناگەیەنێت و پشتگیریی تێدا دروست نابێت!

بەڵام چەسپێنەران وا نین، چونکە مادەم هەموویان سەیری خودی شتە چەسپاوەکە و واقیعی حاڵ دەکەن، ئەوا دەعواکانیان دەبن بە یەك و یەکدەگرن و هێز بە یەکتری دەبەخشن و، چەشنی هەڵگرتنی بەردێکی مەزن وایە کە هەتا دەستی زیاتر لە هەڵگرتنیدا هاوکار بێت، بەرزکردنەوەی ئاسانتر دەبێت، چونکە هەریەکەیان هێز لەوانی تر وەردەگرێت!

## یادخەرەوەی حەوتەم

ئەی ئەو کەسەی موسڵمانان بۆ کەرەسە و شمەکی قەڵبی دنیای فانی هان دەدات و، بە زەبر و زەنگەوە بەرەو پیشەی بیانی‌یەکان دەیانداتەبەر و، دەستیان لە داوێنی پێشکەوتنی ئەوان پێ گیر دەکات!

ئەی بەدبەختی لاف لێدەری غیرەت!

وریابە! کارێك نەکەیت پەیوەندیی هەندێ کەسی ئەم نەتەوەیە بە ئایینەکەیانەوە بپچڕێنێت. چونکە ئەگەر لە ژێر زەبری چەکوشی چاولێکەریی کوێرانە و ڕەفتاری چەواشەدا ئەو پەیوەندی‌یانە سەبارەت بە هەندێ کەسەوە بپچڕێن، ئەوا لە ئەنجامدا دەبن بە کەسانێکی موڵحیدی زیانبەر لە کۆمەڵ و چەند خراپکارێکی چەشنی ژەهری کوشندە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی. چونکە "مورتەد" لەبەر ئەوەی هەناوی داڕزاوە و ناوەوەی بە تەواوەتی گەنیوە، ژەهرێکی کوشندەیە بۆ ژیانی کۆمەڵ.

هەر لەبەر ئەوەشە کە زانستی "ئوصوول" دەڵێت:

(مورتەد مافی ژیانی نییە، بە پێچەوانەی کافری ذیممی یان پەیمان لەگەڵ بەستراو، کە مافی ژیانیان هەیە).

ئنجا بە لای زانایانی مەزهەبی حەنەفییشەوە شایەتیی کافری ذیممی وەردەگیرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی مرۆڤی لە ڕێ لادەر(فاسق) بە خیانەتکار دادەنرێت، شایەتیی وەرناگیرێت!

دەسا ئەی فاسقی بەدبەخت! زۆریی فاسقان لەخشتەت نەبات. هەرگیز نەڵێیت: بیری زۆرینەی خەڵکی لەگەڵ مندایە و پشتم دەگرێت! چونکە هیچ فاسقێك بە ئارەزووی خۆی و لەبەر خودی "فاسقێتی" ڕێی فاسقیی نەگرتووەتەبەر، بەڵکو گرفتاری بووە و ناشتوانێت لێی دەرباز بێت. هەرچی کەسی فاسق هەیە پڕ بە دڵ حەز دەکات بۆ خۆی مرۆڤێکی چاك و خاوەن تەقوا بوایە و، لە ناخەوە پێی خۆشە کە سەرگەورە و فەرماندەکانی کەسانێکی ئاییندار و پیاوچاك بن! مەگەر کەسێك - خوا پەنامان بدات - کە هەڵگەڕانەوە و مورتەددی لە ناخی دڵیدا بە تەواوی ڕیشەی داکوتابێت و بە یەکجارەکی دەروون و هەناوی پێی داڕزابێت و، وەکو ماری لێ هاتبێت کە لەزەت لە پێوەدان و ئازاری خەڵکدا دەچێژێت!

ئەی عەقڵە چەپەڵ و، دڵە گەنیوە داڕزاوەکە!

ئایا تۆ لەو گومانەدایت کە موسڵمانان حەزیان لە دنیا نییە و بیری لێ ناکەنەوە، بۆیە وا بەم جۆرە گرفتاری دەستکورتی و هەژاری بوون و، پێت وایە ئێستا پێویستیان بە کەسێکە لە خەوی بێ ئاگایی بێداریان بکاتەوە، تا لەو بەشەی لە دنیادا هەیانە لە بیریان نەچێت؟!

نەخێر.. لە گومانەکەتدا بە هەڵەدا چوویت و نیشانەکەت نەپێکاوە!

بەڵکو ڕاستی پێچەوانەی ئەم گومانەی تۆیە، ئەوان هێندە بە توندی دەستیان لە داوێنی دنیا گیر کردووە و لە هەڵپەدان بۆ بەدەستهێنانی تا بە

جـارێ لـه ئـه‌نجامی ئـه‌م هه‌ڵپه‌یـه‌دا كه‌وتوونه‌تـه چنگـی هـه‌ژاری و داوی نه‌بوونی‌یه‌وه. چونكه "هه‌ڵپه‌كاری" بۆ مرۆڤی ئیماندار هۆی ڕه‌نجه‌ڕۆییـه و لـه ئاكامدا دووچاری نـه‌بوونی و ڕه‌جاڵی و نزمیـی ده‌كات، بـه ڕاده‌یـه‌ك كـه وته‌ی: "الحريصُ خائِبٌ خاسر" به وێنه‌ی په‌ندێك ده‌ماوده‌می پێ ده‌كرێت.

بەڵێ، ئه‌و هۆكارانه‌ی كـه مرۆڤ بـه‌ره‌و دنیـا هـان ده‌ده‌ن، گه‌لـێ زۆرن. یه‌كێك له‌وانه "ده‌روونی به‌دخواز"ه كه له هه‌موو مرۆڤێكدا هه‌یه. یه‌كێكی تر "هـه‌وا و ئاره‌زووه‌كـان و هه‌سـت و شـه‌یتانی دوژمـن"ه. سـه‌ره‌ڕای "هـاوڕێی خراپی وه‌ك تۆ" و، سـه‌رباری "تـامی شـیرین و به‌لـه‌زه‌تی خێرا و حـازریی دنیا" و، جگه له‌مانه‌ش له‌و بانگه‌وازكاره زۆر و زه‌به‌ندانه‌ی تر كه خه‌ڵكی بۆ لای دنیا بانگ ده‌كه‌ن.

بـه‌ڵام بانگـه‌وازكارانی ئـه‌ودنیای هه‌میشـه‌یی و ڕێنمایی كـارانی ژیـانی هه‌تاهه‌تایی تاڵێی كه‌من.

جا ئه‌گه‌ر به ئه‌ندازه‌ی یه‌ك دانه گه‌ردیله غیره‌ت و جوامێریت به‌رامبه‌ر به‌م نه‌ته‌وه‌یه تێدایه و، له لافی خۆبه‌ختكردن و فیداكاریدا ڕاست ده‌كـه‌یت، ئه‌وا ده‌ستی یارمه‌تی بۆ ئه‌و كه‌سه كه‌مانه درێژ بكه، ئه‌وانه‌ی كه خه‌ڵكی بـۆ ژیـانی هه‌میشـه‌یی و نـه‌بڕاوه‌ی ئه‌ودنیا بـانگ ده‌كـه‌ن. خۆ ئه‌گـه‌ر یـاریده‌ی لایه‌نـه زۆره‌كه بده‌یت و ده‌می ئه‌و بانگه‌وازكاره كه‌مانـه بیه‌ستیت، ئـه‌وا بـاش بزانـه كـه بـه‌م كـاره‌ت ده‌بیـت بـه هـاوده‌م و هـاوكاری شـه‌یتان، كـه چه‌پـه‌ڵترین هاوڕێ و خراپترین هاوده‌مه.

ئایا تۆ پێت وایه كه هه‌ژاریی ئێمه ئه‌نجامی زوهدی ئایینی یان هی ته‌مبه‌ڵیی وازهێنانه له دنیا؟

لـه‌م گومانـه‌تدا گه‌لـێ بـه هه‌ڵـه‌دا چوویـت! نـابینیت "مـه‌جووس" و "به‌رهه‌می"یه‌كانی چین و هیندسـتان و، "ڕه‌ش پێسـته‌كان"ی ئـه‌فریقا و، گه‌لـه

ژێردەستەکانی تری هاوچەشنیان، لەوانەی کەوتوونەتە ژێر چەپۆکی زەبر و زەنگی ئەوروپاوە، گەلێ لە ئێمە هەژارترن؟

ئایا نابینیت هەر تەنها ئەوەندە نەبێ کە هۆی مان و نەمردن و مایەی بژێو بێت هیچی تر بە دەستی موسلمانانەوە نامێنێت و، سەرجەمی دەستکەوت و داهاتەکانی تریان تێکڕا کافرانی ستەمکاری ئەوروپا زەوتی دەکەن، یان مونافیقانی ئاسیا - بە فرتوفێڵ و پیلانی چەپەڵ - دەیدزن و لە دەستی موسلمانان دەری دەهێنن؟!

خۆ ئەگەر مەبەستیشتان لە بەرەوپێشدانی زۆرەملێی موسلمانان بەرەو "مەدەنییەتی دەنییەت" (واتە بێ میم) ئاسانکردنی کاری بەڕێوەبردن و سەقامگیربوونی یاسا و باڵ ڕاکێشانی ڕێسا و ئاسایش بێت، ئەوا هەڵەیەکی گەلێ مەزن دەکەن و بەم ڕەفتارەتان ئەم نەتەوەیە بەرەو هەڵدێری ڕێیەکی هەڵەتی سەخت و بێ کەڵك ڕاپێچ دەکەن. چونکە بەڕێوەبردنی سەد کەسی فاسقی بەدڕەوشت لەوانەی کە گومان لە بیروباوەڕیاندا هەیە، هەروەها چەسپاندنی ئاسایش و ڕێسا لەناو ئەو جۆرە کەسانەدا، گەلێ سەخت و دژوارترە لە بەڕێوەبردنی هەزار کەسی خاوەن تەقوای خواناس و، بڵاوکردنەوەی ئاسایش لە نێوانیاندا.

جا لەسەر بناغەی ئەمانەی باس کران، دەبێ بزانرێت کە: موسلمانان هەرگیز پێویستیان بەوە نییە بەرەو هەڵپەکاری هان بدرێن و دەستیان لە داوێنی شمەکی قەڵبی دنیا گیر بکرێت.

بەم شێوازە هەرگیزاو هەرگیز پێشکەوتن نایەتەدی و ڕێسا و ئاسایش بەرقەرار نابێت. بەڵکو ئەوان پێویستیان بەوەیە کە هەوڵ و کۆششیان ڕێك بخەن و، متمانە بە یەکتری لە نێوانیاندا بڵاو بکرێتەوە و، هۆکارەکانی هاوکاریی نێوانیان ئاسان بکرێن. ئەم ئەنجامانەش بەوە دێنەدی کە شوێن

فەرمانە خاوێن و پیرۆزەکانی ئـاین بکەون و، لەسەری بەردەوام و سوور و دامەزراو بن. هاودەم لەگەڵ دەست گرتندا بە تەقوای خوای گەورەوە و، کارکردنیان تەنها لە پێناوی ڕەزامەندیی ئەودا.

## یادخەرەوەی هەشتەم

ئەی ئەو کەسەی پەی بەو لـەزەت و بەختەوەرییە نابات کە لـە هەوڵ و کارکردندا هەن! ئەی تەمبەڵی تەوەزەل!

بزانە کە:

خواوەنـدی حەق و مەزن، لەبەر کەماڵی بەخشندەیی خـۆی، هـەر لـە دووتوێی خزمەت کردندا پاداشتی ئەو خزمەتە و، لـە نێوان کـار و کۆششـدا قازانج و دەستکەوتی ئەو کار و کۆششەی داناوە.

لەبەر ئەمەیە کە هەموو بوونەوەران بە بێ گیانەکانیشـەوە - لـە سۆنگەیەکی تایبەتییەوە - لە کاتی ئەنجامدانی کار و فرمانە تایبەتییەکەیاندا بە چەشنە لەزەتێکی تایبەتی و شەوق و تامەزرۆییەکی تەواوەوە گوێڕایەڵیی ئـەو فەرمانـە پەروەردگارییانـە دەکـەن کـە پێیـان دەوترێـت: "الأوامـر التكوينية". ئەوەتا هەموو شتێك هەر لـە هەنگ و مێرووله و باڵندەوە، هەتا دەگاتە مانگ و خۆر، هەریەکەیان بە چێژ و لـەزەتێکی تەواوەتییـەوە بـۆ ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی تێدەکۆشێت و لـێ دەبڕێت.

واتە لەناو خودی فەرمانبەرداریی بوونەوەراندا "لـەزەت" هەیە. چونکە ئەو بوونەوەرانە بەوپەڕی ڕێکوپێکییەوە ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ دەکەن، هەرچەندەش نافامن چ کارێك دەکەن و پەی بە ئەنجامی ئیشەکەیان نابەن!

ئەگەر دەڵێیت: بوونـی لـەزەت لـە زیندەوەرانـدا شتێکە ڕێی تێدەچێت، ئەی چۆن دەکرێ شەوق و لەزەت لە بێ گیانەکاندا بێت؟

لە وەڵامدا دەڵێین: بێ گیانەکان داخوازی: "شەرمەندی" و "پلە" و "کەماڵ" و "جوانی" و "رێکوپێکی"ن کە تیایاندا ببێت. تەنانەت ئەوان بە دوای هەموو یەکێك لەو شتانەدا دەگەڕێن تا بەدەستیان بهێنن. ئەمەش نەك لە پێناوی خۆیاندا، بەڵکو لە پێناوی دەرخستنی ئەو ناوە جوانانەی خوای گەورە کە تیایاندا دەدرەوشێنەوە.

لەبەر ئەوە، بێ گیانەکانیش لە دەمی جێبەجێ کردنی فەرمانبەرییە سروشتییەکانی سەرشانیاندا "ڕوونی" و "بەرزی" بەدەست دەهێنن. چونکە لە کاتی ئەنجامدانی کار و فرمانەکانیاندا وەکو چەند ئاوێنەیەکی تیشك دەرەوەی درەوشانەوەی ناوەکانی خواوەندی "نور الانوار"یان لێ دێت.

با دڵۆپە ئاوێك یان پارچە شووشەیەك بە نموونە بهێنینەوە. ئەوەتا هەریەك لەم دوانە هەرچەند لە خۆیدا بێ نرخ و تاریکە، بەڵام ئەگەر بە دڵە خاوێنەکەی ڕوو بکاتە خۆر، یەکسەر دەبێت بە جۆرە عەرشێك بۆ خۆر و بە ڕوویەکی گەش و ڕوونەوە بۆت دەڕوانێت.

هەموو گەردیلەکان و گشت بوونەوەران، وەك ئەم نموونەیە وان، لەو ڕووەوە کە ئەرکی "ئاوێنەی تیشك دەرەوەی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خواوەندی جوان و خاوەن کەماڵی ڕەها" ئەنجام دەدەن.

ئەوان - لەم کاتەدا - پلەیەکی لەوپەڕی بڵندی و بەرزیدا بەدەست دەهێنن کە تابڵێیت ئاشکرا و ڕووناکە. چونکە ئەو دڵۆپە ئاوە یان ئەو پارچە شووشەیە لە نزمایی خامۆشی و تاریکییەوە بەرەو لوتکەی دەرکەوتن و ڕووناکبوونەوە بەرز دەبنەوە.

لەبەر ئەوە، دەتوانرێت بوترێ: "مادەم بوونەوەران پلەیەکی نوورانی و بەرز لە ئەنجامدانی ئەرکی ئەستۆیاندا بە دەست دەهێنن، ئەوا بەوپەڕی لەزەت و چێژەوە فەرمانبەرییەکانی ئەستۆیان ئەنجام دەدەن".

ئنجا دەبێ بزانین کە لەزەت چەشتنی ئەمانە لە کارەکانیان شتێکی مومکینە گەر ئەو بوونەوەرە بەشێکی لە "ژیانی گشتی"دا بیێت.

باشترین بەڵگە لەسەر بوونی لەزەت لە دووتوێی فەرمانبەری‌یەکەیاندا، ئەمەی خوارەوەیە:

سەرنج لە کار و ئەرکی ئەندام و هەستەکانت بدە، دەبینیت هەرکام لەوانە کە لە پێناوی مانەوەی "کەس" یان "جۆری مرۆڤ"دا ئەرکەکانی سەرشانی رادەپەڕێنێت، چەندین تام و لەزەتی جۆراوجۆری دەست دەکەوێت. بەڵکو خودی ئەو فەرمانبەری و کار و ئەرکانەش وەك جۆرە لەزەتێك وان سەبارەت بەو ئەندامە. لەوەش زیاتر، وازهێنان لە فەرمانبەرداری و دەست هەڵگرتن لە کار و کۆشش، ئازارێکی بەسوێی ئەو ئەندامە دەدات.

جگە لەمەش، بەڵگەیەکی تری ڕوون هەیە، دەبینیت "کەڵەشێر" لە پێش خۆیدا خەمی مریشکەکان دەخوات، ئەوەتا ڕۆزی‌یەکەی خۆی - کە بریتین لەو دان و دەنکە دانەوێڵانەی دەیانچنێتەوە - بەجێیان دەهێڵێت بۆ مریشکەکان و خۆی نایانخوات، کاتێکیش کە ئەم ئەرکە جێبەجێ دەکات لەوپەڕی شەوق و شانازی و لوتکەی لەزەتدا بەدی دەکرێت! کەواتە چێژێك لەو خزمەتەدا هەیە کە لە چاو تام و لەزەتی خودی خواردنەکە گەلێ مەزنتر و زیادترە!

هەمان شت لەناو ئەو مریشکانەدا دەبینیت کە سەرپەرشتیی جووجەڵەکانیان دەکەن، ئەوەتا لە بریی خۆی خەمی ئەوان دەخوات و لە پێناوی جووجەڵەکانیدا خۆی بە برسێتی دەهێڵێتەوە. تەنانەت لە پێناوی ئەواندا خۆیشی بەخت دەکات و بۆ پاریزگاریی وردیلەکانی، هێرش بۆ سەر ئەو سەگانەش دەبات کە پەلاماری جووجەڵەکانی دەدەن!

کەواتە ئەو لەزەتەی لە خزمەتکردندا هەیە، لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە، بە ڕادەیەك کە لە چاو تاڵیی برسێتیدا گەلێ بەتین و بەهێزترە و، ئازاری مردنیشی لە پێناودا هەڵدەبژێرێت. نابینیت دایکانی زیندەوەران ئەوپەڕی لەزەت لە پارێزگاری کردنی بێچووەکانیان دەچێژن هەتا ئەو بێچووانە بچووك بن، بەڵام هەر ئەوەندەی گەورە دەبن، ئەرکی سەرشانی دایکیان تەواو دەبێت و لەزەتەکەشی دەبڕێتەوە و، هەر ئەو دایکە لەو بێچوانەی خۆی دەدات کە پێشتر چاودێریی دەکردن! تەنانەت هەندێ جار "دان"یشیان لێ دەفڕێنێت!

ئەم یاسا خواییە، لە مرۆڤدا نەبێت لە هەموو زیندەوەراندا دەست بەکارە. بەڵام لە مرۆڤدا تا ڕادەیەك ئەرکی دایك هەر بەردەوام دەبێت.

ئنجا لەبەر ئەوەش کە "لاوازی" و "کۆڵەواری" بە درێژایی ژیان هاودەمی مرۆڤن، ئەوا مرۆڤ هەندێ لایەنی منالێتیی هەر تێدا دەمێنێت، کەواتە هەمیشە پێویستی بە شەفەقەت و میهرەبانییە.

بەم جۆرە، سەربجی نێرینەی هەموو زیندەوەران بدە، وەك سەربجت لە کەڵەشێر دا. هەروەها لە گشت دایکانیش ورد بەرەوە، وەك لە مریشك ورد بوویتەوە. ئنجا تێبگە کە چۆن ئەو زیندەوەرە لە پێناوی خۆی و کەماڵی زاتیی خودی خۆیدا نییە کاتێ ئەو کارمەندییەی ئەستۆی ئەنجام دەدات، چونکە - گەر پێویست بێت - خۆیشی بەخت دەکات. بەڵکو ئەو ئەرکەی سەرشانی لە پێناوی ئەو نیعمەت بەخشە میهرەبان و بەدیهێنەرە مەزنەدا جێبەجێ دەکات کە لەو فەرمانبەرییەدا خستوویەتیە کار.

ئەو بەدیهێنەرەش - بە میهرەبانیی فراوانی خۆی - لەزەت و چێژێکی لە نێوان خزمەت و فەرمانبەرییەکەدا بۆ داناوە.

جگە لەمە، بەڵگەیەکی تریش لەسەر ئەوەی کە پاداشت لە دووتوێی خودی کار و کۆششدا هەیە، ئەوەیە کە ڕووەکەکان بە چەشنێکی ئەوتۆ گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی بەدیهێنەری مەزنیان دەکەن کە وا هەست بکرێت شەوق و لەزەت لەو کارەیاندا بێت! چونکە ئەو بۆن و بەرامە عەترین و دڵگیرانەی پەخشی دەکەن و، ئەو ئارایشتە ناوازانەی خۆیانی پێ دەڕازێننەوە و سەرنجی بینەرانی پێ دەبزوێنن و ئەو فیداکاری و خۆ بەخت کردنانەش کە تا دوا هەناسەیان لە پێناوی گوڵ و بەرەکانیاندا پێشکەشی دەکەن.. هەموو ئەمانە، بۆ کەسانی ژیر و بێدار ڕادەگەیەنن کە:

(ڕووەکەکان لە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکاندا لەزەتێك دەچێژن کە لە سەرووی هەموو چێژ و لەزەتێکەوەیە).

ئایا نابینیت درەختی "گوێزی هیند" و "هەنجیر" بە زمانی حاڵیان لە گەنجینەی میهرەبانیی خوای گەورە داوای چ شیرێکی پوخت و خاوێن دەکەن و ئنجا لێی وەردەگرن و پاشان دەرخواردی بەرەکەی خۆیانی دەدەن، کەچی لە قوڕ بەولاوە هیچی تر دەرخواردی خۆیان نادەن؟!

یان درەختی هەنار نابینیت شەربەتێکی پوخت بە بەرەکەی دەدات کە خوای پەروەردگاری پێی بەخشیوە، بەڵام بۆ خۆی بە شەربەتی ئاوێکی لێڵ قەناعەت دەکات؟

پاشان نەك هەر لەم درەختانەدا، تەنانەت لە دانەوێڵەکانیشدا ئەم ڕاستی‌یە دەبینیت، چونکە بە وێنەی تاسەمەندیی کەسێکی بەندکراو بۆ ژیانی سەربەستی، دانەوێڵەکانیش تاسەیەکی ئاوا مەزن بۆ گوڵکردن دەردەخەن.

جا لە ڕوانگەی ئەم نهێنی‌یەی کە لە بوونەوەراندا دەست بەکارە و پێی دەوترێت: "سنة الله" و، بەپێی ئەم دەستوورە مەزنە، حاڵی مرۆڤی بێ کاری تەمبەڵی ڕاکشاوی ناو پێخەفی پاڵدانەوە، گلەیی لە هی مرۆڤی هەوڵدەری

کۆڵنەدەر پەرێشـانترە و سنگیشـی زۆر لـەو تـەنگترە! چونکـە بابـای بێ کـار هەمیشە سکاڵا لـە دەسـت تەمـەنی خـۆی دەردەبڕێـت و دەیـەوێت بـە گاڵتـە و خێرا لێی بگوزەرێت.

بەڵام هەوڵدەری کۆڵنەدەر هەردەم لـە شـوکرانەبژێری و سوپاسـگوزاریی خوای گەورەدایـە و نایـەوێت تەمـەنی بـە خۆڕایـی لەدەسـت دەربچێـت. هـەر لەبەر ئەوەشە کە وتەی: (المُستريح العاطلُ شاكٍ مِن عمره، و السّاعي المُجِـدُّ شاكرٌ)[١] بووە بە دەستوورێکی گشتی لە ژیاندا و، ئـەو وتەیـەش کـە دەڵێـت: "حەوانـەوە لـە چەشـتنی زەحـمەتدا و زەحـمەتیش لـە حەوانەوەدایـە" وەك ئامۆژگاری و پەندێك دەماودەمی پێ دەکرێت.

بەڵێ، ئەگـەر بـە وردی سـەرنجی بێ گیانـەکان(الجمـادات) بدرێـت، بـە ڕوونی ئەو یاسا خواییە دەردەکەوێت. چونکـە ئـەو بێ گیانانـەی کـە توانـا و لێهاتنیان بە تەواوی دەرنەکەوتووە و لـەم ڕووەوە بـە ناتـەواوی ماونەتـەوە، بـە گورجوگۆڵـی تێدەکۆشـن و تەقالایـەکی مـەزن دەدەن تـاکو لـە دۆخـی هێز(القوة) دەربچن و بڕۆنە دۆخی کار(الفعل)ەوە[٢].

ئەوان لەو چەشنە کاتانەدا بارێکی وەهایان لـێ دەبینرێت ئامـاژە دەکـات بۆ ئەوەی کە: ئەو بێ گیانانـە - بـەپێی ئـەو یاسـا خوایـە - لـە ئـەنجامدانی ئـەو ئەرکە سروشتی و ئاڵوگۆڕەدا شـەوق و چێژ و لـەزەتیان دەسـت دەکـەوێت.

---

(١) واتە: ئەو کەسەی دەستی بەتاڵە و لە حەوانەوەدایە، هەمیشە سکاڵا لە دەست تەمـەنی خـۆی دەکات.. بەڵام ئەو کەسەی لە هەوڵ و تێکۆشان و لێبڕاندایە، هەمیشە شوکرانەبژێرە. (وەرگێڕ)

(٢) هێز و کار(القوة والفعـل) دوو زاراوەی زانسـتی مـەنتیقن. ئەمـەی خـوارەوە نموونەیەکە بۆ ڕوونکردنەوەی هەردووکیان:

دەتوانیت سەبارەت بە تۆوی هەر درەختێك بڵێیت: ئەمـە درەختـە! واتـە لـە هێز و توانایدا هەیـە ببێت بە درەخت، جا پێش ئەوەی ببێت، درەختە وا لە دۆخی هێزدا(شجر بالقوة) بەڵام کاتێ کە بوو بە درەختێکی بەرجەستە، ئەوا ڕۆشتووەتە دۆخی کارەوە(شجر بالفعل). (وەرگێڕ)

جا ئەو بێ گیانە ئەگەر بەشی لە ژیانی گشتیدا بیێت ئەوا ئەو شەوقە هی خۆیەتی، دەنا هی ئەو کەسەیە کە نوێنەر و سەرپەرشتیکاری ئەوە.

تەنانەت لەسەر بناغەی ئەم ڕاستی‌یە دەتوانرێت بوترێ کە: "ئاو"ی شل و ڕەوان کاتێ فەرمانی "بەستن"ی دەدرێتێ، ئەوەندە بە گورجی و چوستی و شەوقەوە جێبەجێی دەکات، ئاسنیش پەراش پەراش دەکات.. ئەوەتا هەر ئەوەندەی ساردوسڕی و پلەکانی بەستنی ئاو فەرمانێکی خوای گەورە بە ئاوێکی ناو دەفرێکی ئاسنین ڕادەگەیەنن، ئەو ئاوە هێندە بە توندی و چوستی و شەوقەوە فەرمانەکە ڕادەپەڕێنێت کە دەفرە ئاسنینەکە دەشکێنێت و جێی خۆی دەکاتەوە و دەبێت بە سەهۆڵ!

هەرچی جموجوولی ناو گەردوون هەن، هەموویان لەسەر ئەمە قیاس بکە، هەر لە خۆرەکانەوە لە سووڕگەکانیاندا تا دەگاتە سووڕانەوە و خولانەوە و لەرینەوەی (عاشقانە و مەولەوی ئاسای)[1] گەردیلەکان. هەموو شتێك بەپێی یاسای قەدەری خوا ڕەفتار دەنوێنێت و، بە فەرمانی تەکوینی دەرچووی دەستی توانستی خوای گەورەش (کە زانست و فەرمان و ویستی خوا دەگرێتەوە) دێتە بوون. بە ڕادەیەك کە هەموو گەردیلە و بوونەوەر و زیندەوەرێك وەك سەربازی سوپا وایە؛ پەیوەندی و کاری جیاجیا و جۆراوجۆری لەگەڵ یەك بە یەکی فەرمانگەکانی سوپاکەیدا هەیە.

بۆ نموونە: ئەو گەردیلەیەی وا لە چاوتدا، پەیوەندیی بە هەموو خانە و دەمارەکانی چاوەوە لە ڕووی مرۆڤدا و بە خوێنبەر و خوێنهێنەرەکانی

---

(١) نووسەر لێرەدا جموجوولەکانی بوونەوەرانی ناو گەردوون بە جەزبە و حاڵ لێهاتنی موریدی تەریقەتی مەولەوی "مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی" دەشوبهێنێ، کە بە دەوری خۆیدا دەخولێنەوە و، لە هەمان کاتیشدا بە دەوری ئەلقەی زیکرەکەیدا دەسووڕێنەوە. (وەرگێڕ)

لەشەوە هەیە. هەر لەسەر بناغەی ئەم پەیوەندییانەشە کە کار و فەرمانبەری و چالاکی‌یەکی دیاری کراوی بۆ دادەنرێت و، لە ڕووناکیی ئەم پەیوەندییانەوەیە کە چەندین سوود و بەرژەوەندی بەرهەم دەهێنێت.

بەم جۆرە، هەموو شتێکی ناو بوونەوەر بۆ خۆت لێکبدەرەوە.

لەسەر ئەم بناغەیە، هەر شتێك لە بوونەوەردایە، لە دوو لایەنەوە، شایەتی لەسەر "پێویستیی بوون"ی خوای گەورەی خاوەنی توانستی ڕەها دەدات:

لایەنی یەکەم: ڕاپەڕاندن و ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە هەزاران جار لە وزەی خۆی زیاترن، لە کاتێکدا کە ئەو بوونەوەرە بۆ خۆی لە ئەنجامدانی کاری وادا گەلێ کۆڵەوار و دەستەوسانە.

لایەنی دووهەم: تەبایی جمو جوولەکانی لەگەڵ ئەو دەستوورانەی کە ڕێسای جیهان ڕێکدەخەن و، گونجاویی کارەکانی لەگەڵ ئەو یاسایانەی کە هاوسەنگیی بوونەوەران ڕاگر و بەردەوام دەکەن.

جا ئەو بوونەوەرە لەم ڕووەوە و بەم تەبایی و گونجاوی‌یەی، شایەتی لەسەر بوونی ئەو خواوەندە زانا و بەتوانایە دەدات. چونکە بێ گیانێکی وەك "گەردیلە" یان مێروویەکی وەك "هەنگ" هەرگیز سەر لە ڕێسا و هاوسەنگی دەرناکات کە دوو مەسەلەی ورد و گرنگی ناو "کیتابی موبین"ن[1] (کە بریتی‌یە لە توانستی خوای گەورە) چونکە گەردیلە و هەنگ لە کوێ دەتوانن ئەو کتێبە بخوێننەوە کە لە دەستی ئەو کەسەدایە دەفەرموێ:

﴿يومَ نَطْوِي السَّماءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾ (الأنبياء:١٠٤)؟!

---

(١) مامۆستا نوورسی لە پێشەکی مەبەستی دووهەمی وتەی "سی‌هەم"دا بۆچوون و تێگەیشتنی خۆی لە : "ئیمامی موبین" و "کیتابی موبین" ڕوون کردووەتەوە. بڕوانە کتێبی (وتەکان ل ٨١٩-٨٢٠). (وەرگێڕ)

کەس ناتوانێت دەست بە ڕووی ئەم شایەتی‌یەوە بنێت کە گەردیلە دەیدات، مەگەر بەکێك بە نەفامی و هەرزەییەکی لەڕادەبەدەرەوە لەو گومانەدا بێت کە ئەم گەردیلەیە یان ئەو هەنگە خاوەنی چاوێکی تیژی وەهایە بتوانێت پیتە وردەکانی ناو "کیتابی موبین" بخوێنێتەوە!

بەڵێ، بەدیهێنەری دانا دەستوور و فەرمانەکانی "کیتابی موبین" بەوپەڕی جوانی و پوختی و کورتی، لە دووتوێی لەزەت و پێویستی‌یەکی تایبەتیی ئەو شتەدا دادەنێت. جا ئەگەر هەر شتێك بەپێی ئەو لەزەت و پێویستی‌یە تایبەتی‌یەی خۆی کارێکی ئەنجام دا، ئەوا - بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت - فەرمانەکانی ئەو کیتابی موبینەی جێبەجێ کردووە.

بۆ نموونە: سەیری "مێشوولە" بکە، دەبینیت هاودەم لەگەڵ لەدایکبوون و هاتنیدا بۆ دنیا یەکسەر لە ماڵەکەی دەردەچێت و هێرش بۆ سەر دەموچاوی مرۆڤ دەبات و بە گۆچانە درێژ و لمۆزە باریکەکەی، سەروسیمای ئادەمیزاد دادەگرێتەوە و شلە زیندەیی(سائل حیوي)یەکەی[1] دەتەقێنێتەوە و تا دەتوانێت لێی هەڵدەمژێت. ئنجا لەم هێرش و پەلاماردانەشدا کارامەیەکی یەکجار ناوازەی سەربازی‌یانە دەنوێنێت.

ئایا کێ ئەم کارامەیە ناوازەو، پیلانە وردە جەنگی‌یانەو، وردەکاری و لێزانینەی لە تەقاندنەوەی خوێنی مرۆڤدا فێری ئەم بەدیهێنراوە تازە بۆ دنیا هاتووە کرد کە هیچ مەشق و ئەزموونێکی زووتری بە خۆیەوە نەدیوە؟! لە کوێ ئەم زانیاری‌یانەی بەدەست هێنا؟

منی سەعیدی هەژار دان بەوەدا دەنێم کە ئەگەر من بوومایە لە بریی ئەو، مەگەر دوای چەندین تاقیکردنەوەی دوور و درێژ و، دەرس و ئامۆژگاریی

---

(١) مەبەست خوێنە. (وەرگێڕ)

یەك لە دوای یەك و ماوەی زۆر و درێژخایەن نەبوایە هەرگیز فێری ئەو پلان و کارامەییە سەربازی و هێرش و پەلامار و وردەکارییانە نەدەبووم لە دەرهێنانی ئەو شلەمەنییەی جەستەی مرۆڤدا!

بۆ خۆت "هەنگ"ی ئیلهام کراو و، جالجالۆکە و، بولبول - کە بە جۆرێکی ناوازەی ڕەنگین هێلانەکەی دەتەنێت - بەم پێوەرە لێك بدەرەوە. تەنانەت دەتوانیت ڕووەکیش قیاس بکەیتە سەر گیانداران.

بەڵێ، خوای گەورەی شکۆمەندی خاوەنی سەخاوەتی ڕەها و بێسنوور "کارتێکی پێناس"ی بە دەستی هەموو یەکێك لە زیندەوەران سپاردووە. هەموو یەکێك لەو کارتانەش بە پێنووسی "لەزەت" و مەرەکەبی "پێویستی" نووسراونەتەوە و، خوای گەورە بەرنامەی فەرمانە تەکوینییەکانی خۆی و، پێویستیی فەرمانبەری و کاروبارەکانی هەموو یەکێك لەو زیندەوەرانەی لە کارتی پێناسی ئەودا تۆمار کردووە.

کەواتە خاوێنی بۆ ئەو خواوەندە دانا و شکۆمەندەی کە بەم جۆرە هەموو دەستوورەکانی "کیتابی موبین"ی تایبەت بە "هەنگ"ی لەو کارتی پێناسە بچووکە و لە سەری هەنگدا نووسیوە و تۆماری کردووە و کردوویەتی بە کلیلی لەزەتێکی تایبەتیی هەنگ کە هەمیشە لە کار و کۆششدایە، تاکو هەنگ - بەو کلیلە - پێناسەکەی ناو مێشکی بکاتەوە و بەرنامەی کارەکانی خۆی تێدا بخوێنێتەوە و پەی بە ئەرکەکانی سەرشانی ببات و، بەپێی ئەو بەرنامەیە هەوڵ و تەقالا بدات و، یەکێك لەو دانایییانە بخاتە ڕوو کە لە ئایەتی: ﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ﴾دا (النحل:٦٨) جەم کراون!

دەسا ئەی ئەو کەسەی کە ئەم یادخەرەوەی هەشتەمە دەخوێنێتەوە یان دەبیستی!

ئەگەر بە ڕاستی و تەواوی لێی تێگەیشتوویت، لەوا لە نهێنییەکی: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ (الأعراف:١٥٦) گەیشتوویت و..

"یەی"ت بە یەکێك لە ڕاستییەکانی: ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾(الإسراء:٤٤) بردووە و..

بە یەکێك لە دەستوورەکانی: ﴿إنما أَمْرُهُ إِذا أَرادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (يس:٨٢) شادبوویت و..

مەسەلەیەکی ورد و ناسکی نێوان مەسەلەکانی: ﴿فَسُبْحانَ الَّذي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (يس:٨٣) فێر بوویت!

## یادخەرەوەی نۆهەم

بزانە کە:

"پێغەمبەرێتی"ی ناو گرۆی مرۆڤ: پوختەی هەرچی خێر و، بناغە و کاکڵەی هەموو کەماڵێکە..

هەروەها "ئاینی حەق و ڕاستەقینە"ش(ئیسلام): پێرستی گشت بەختەوەرییەك و..

"ئیمان"یش: جوانیی پاك و خاوێنی دوور لە هەموو خلتەیەکە.

جا مادەم جوانییەکی پرشنگداری درەخشان و، ڕێژنەیەکی بەرز و فراوان و، حەقێکی ئاشکرا و، کەماڵێکی زۆر لەم جیهانەدا دەبینرێن، ئەوا بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی دەزانرێت کە: هەرچی حەق و ڕاستی هەیە، تێکڕا لە لای ڕێڕەوی "پێغەمبەرێتی" و، لەناو دەستی "پێغەمبەران"دا - درووديان لەسەر بێت - کۆبوونەتەوە. گومڕایی و، شەڕ و، زیانیش لە لای نەیارەکانیان.

ئەگەر دەتەوێت ئەمەت بۆ دەربکەوێت ئەوا سەیرێکی یەك لە هەزاری ئەو نموونانە بکە - کە هەر هەموویان - جوانی‌یەکانی ئەو "بەندایەتی"یە دەنوێنن کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ بۆ گرۆی مرۆڤی هێناوە.

نموونەکەش ئەمەیە:

پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی جەماعەت و، جومعە و، جەژنەکاندا "دڵ"ی یەکتاپەرستان بە "خواپەرستی" یەکدەخات و، "زمان"ی هەمووشیان لەسەر "یەك وشە" کۆدەکاتەوە، بە ڕادەیەك کە گرۆی مرۆڤ بە: (نزا و دەنگی چەندەها دڵ و زمانی بێ سنوور) و بە: (هاوکاری و پشتگیریی یەکتر) کارێك دەکەن کە شایستەی ئەوە بن ڕووبەڕووی فەرمایشتی پەرستراوی ڕاستەقینەی خۆیان ڕابوەستن، بە چەشنێ کە هەر هەموویان پێکەوە بەرامبەر "مەزنیی خوایەتی"ی پەرستراوی ڕاستەقینەیان "بەندایەتی‌یەکی یەکجار فراوان"ی ئەوتۆ دەنوێنن کە دەڵێی خودی "گۆی زەوی" خۆیەتی ئەو زیکرەی لە زار دەردەچێت و، ئەو نزا و دوعایە دەکات و، بە گشت سووچ و هەرێم و ناوچە و مەڵبەندەکانیەوە نوێژ بۆ خوای گەورەی خۆی بەجێ دەهێنێت و، گوێڕایەڵی ئەو فەرمانە دەبێت کە بە شکۆداری و مەزنی‌یەوە لە سەرووی هەر حەوت ئاسمانەکانەوە هاتووە و دەفەرموێ:

﴿وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ﴾ (البقرة: ١١٠)!

ئەم مرۆڤەی کە لە خۆیدا بەدیهێنراوێکی لاوازی بچووکی چەشنی گەردیلەیەکی نێوان ئەم جیهانەیە، کەچی بەم یەکگرتنەی و، لە ڕووی مەزنیی بەندایەتی‌یەکەیەوە بۆ خوای گەورە، پلەی: "بەندەی خۆشویستراو"ی بەدیهێنەری ئاسمان و زەوی و، پایەی: "جێنشینی" و "پادشایی" لە زەویدا بەدەست هێناوە و بووە بە فەرماندەی گشت زیندەوەران و ئامانج و ئەنجامی بەدیهێنانی هەموو بوونەوەران.

خۆ ئەگەر دەنگی ئەو "تەکبیرانەی" کە پاش نوێژەکان بە تایبەت نوێژی جەژن لە زاری سەدان ئیماندارەوە دەردەچێت، وەك لە جیهانی "غەیب"دا یەکیان گرتووە، ئاوەهاش لە جیهانی ئاشکرا و بینراودا بە یەك دەنگ دەرببڕێن و یەکبگرن، ئایا ئەو دەنگە یەکسان نابێت بە دەنگی "اللە أکبر"ێك کە گۆی زەوی بیڵێت و بە ئەندازەی مەزنیی قەبارەکەی خۆی دەری ببڕێت؟ ئەو گۆی زەوی‌یەی کە ئەویش - بۆ خۆی - وەك مرۆڤێکی زەبەلاحی یەکجار مەزنی لێ هاتووە؟!

چونکە بە یەکگرتنی دەنگی تەکبیری یەکتاپەرستانی سەر ڕووی زەوی لە یەك کاتدا، دەنگی "اللە أکبر"ێکی وا مەزن پێکدێت کە دەڵێی لە زاری گۆی زەوی خۆیەوە دەردەچێت! تەنانەت لە نوێژی جەژندا ئەو دەنگە هێندە گەرموگوڕی و مەزنی دەنوێنێت کە بەچەشنی بوومەلەرزە گۆی زەوی دەلەرزێنێتەوە! چونکە بە "اللە أکبر"وتنی جیهانی ئیسلامی، هەموو ناوچە و هەرێمێکی گۆی زەویش "اللە أکبر" دەڵێت و بە تەسبیحات و زیکری ئەوانیش، تەسبیحات و زیکری خوای گەورە دەکات!

ئەوەتا ئەمیش بە "دڵ"ی کەعبەی پیرۆزی - کە قیبلەی جیهانی ئیسلامە - وەك مرۆڤ نییەت دەهێنێت و، بە "زمان"ی عەرەفەش - کە لە دەمی مەککەی پیرۆزدایە - "اللە اکبر" دووپات دەکاتەوە. زایەڵەی دەنگی ئەم تەکبیرانەش، وەکو زایەڵەی بێ سنووری یەك وشەی "اللە اکبر" کە لە یەك زارەوە دەربچێت، ئاوا لە هەوای ئەشکەوتی ناودەمی گشت ئیماندارانی پەرش و بڵاوی جیهاندا، بە چەشنێکی بێ سنوور شەپۆل دەدات. بەڵکو زایەڵەی دەنگی تەکبیر و زیکرەکانی ئەوان لە هەموو شوێنێکی ئاسمانەکان و جیهانەکانی بەرزەخیشدا - بە هەمان جۆر - لە شەپۆل و دەنگدانەوەدان!

کەواتە سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم گۆی زەوییەی کردووە بە بەندەی سوژدەبەر بۆ خۆی و، بە تەرزێکی وەهاش ئامادەی کردووە کە ببێت بە سوژدەگا و مزگەوتی پەرستکارانی و بێشکە و لانەی بەدیهێنراوانی. ئنجا بە ژمارەی گەردیلەکانی زەوی و بە ئەندازەی بوونەوەرانیش سوپاسگوزاری و تەسبیحات بۆ ئەو خواوەندە پێشکەش دەکەین لەسەر ئەوەی کردووینی بە نەتەوەی ئەو پێغەمبەرە بەرێزەی ﷺ کە ئەم جۆرە پەرستشەی فێر کردووین!

## یادخەرەوەی دەهەم

ئەی سەعیدی بێ ئاگای گرفتاری پەرێشان‌حالیی خۆی!
بزانە کە:

گەیشتن بە نووری ناسینی خواوەندی حەق و.. بینینی درەوشانەوەکانی ئەو خواوەندە لەناو ئاوێنەی نیشانەکانی خوایەتیی ئەودا و.. سەیر کردنی ئەو نوورە لە کونیلەی بەڵگەکانی بوونیەوە، داخوازی ئەوەیە کە بە پەنجەی ڕەخنە ئەو نوورانە هەڵنەسەنگێنیت کە بۆ دڵت دێن و لە ژێریت دەردەکەون. هەرگیز نابێت بە دەستی دوودڵی ڕەخنەیان ئاراستە بکەیت.

کەواتە دەست بۆ گرتنی هیچ نوورێك درێژ نەکەیت کە لێت دەربکەوێت! بەڵکو لەو چەشنە کاتانەدا بە تەواوی دەستبەرداری گشت هۆکارەکانی گومڕایی ببە و، خۆت بەر تیشکی ڕووناکیی ئەو نوورە بخە و، ڕووی تێ بکە. چونکە من بۆ خۆم بینیم و بۆم دەرکەوت کە شایەت و بەڵگەکانی ناسینی خوای گەورە، سێ بەشن:

بەشێکیان: وەك ئاو وایە؛ دەبینرێت و هەستی پێ دەکرێت، بەڵام بە پەنجە ناگیرێت! سەبارەت بەم بەشەیان دەبێ بە تەواوی خۆت بهاوێتە ناوی و

دەست لە هەموو ئەندێشەیەك دابشۆیت. جا مادەم ئەم بەشە وەك "ئاو" وایە و لەناو پەنجەدا ناوەستێ و دادەچۆڕێت و دەڕوات، ئەوا بە پەنجەی ڕەخنەگرتن هەڵی‌مەسەنگێنە، چونکە "ئاوی ژیان" ڕازی نابێت پەنجە بکات بە نیشتەجێی خۆی!

بەشی دووهەم: وەك "هەوا" وایە؛ هەستی پێ دەکرێت، بەڵام نابینرێت و ناگیرێت! دە تۆیش ڕوو لە شنە و سروەی ئەو میهرەبانی‌یە بکە و، خۆتی لە بەرامبەرەوە ڕابگرە و، بە "ڕوو" و "دەم" و "گیان"ت ڕووبەڕووی ڕابووەستە. خۆ ئەگەر لە بریی ئەوەی "گیان"ت بەم بەشە بووژێنیتەوە، بچیت بە چاوی دوودڵی و گومانەوە بۆی بڕوانیت و دەستی ڕەخنەی بۆ درێژ بکەیت، ئەوا لە دەستت دەرباز دەبێت و دەڕوات، چونکە ڕازی نابێت دەستی تۆ بکات بە مەڵبەند و مەنزڵی خۆی!

بەشی سێ‌هەم: وەك "ڕووناکی" وایە؛ دەبینرێت، بەڵام ناگیرێت! تۆیش لە بەرامبەر ئەم بەشەوە خۆت ڕابگرە و، بە بینایی "دڵ" و ڕوانینی "گیان" ڕووبەڕووی ڕابووەستە و ڕووی بینینی خۆتی ئاراستە بکە. ئنجا چاوەڕوان بە. لەوانەیە ئەو لە خۆیەوە بێت بۆ لات، چونکە "ڕووناکی" نە بە دەست دەگیرێت و نە دەشکەوێتە ناو داوی پەنجەی تۆوە، بەڵکو تەنها بە نووری بینایی دڵ ڕاو دەکرێت. خۆ ئەگەر دەستێکی ماددیی هەڵپەکاری بۆ درێژ بکەیت و بتەوێت بە تەرازووی ماددی هەڵی بسەنگێنیت، دڵنیابە کە هەرچەندەش ئەو نەکوژێتەوە بەڵام لێت ون دەبێت. چونکە "ڕووناکی"ی ئاوا هەروەك ڕازی نابێت "شتی ماددی" بەندی بکات و مل بۆ کۆت و زنجیر کەچ ناکات، ڕازیش نابێت "شتی چڕ" ببێت بە خاوەن و فەرماندە و سەرکردەی!

## یادخەرەوەی یازدەهەم

سەیری پلەی میهرەبانیی فراوان و شەفەقەتی مەزنی قورئانی پیرۆز بکە بەرامبەر جەماوەری عەوامەکان و، فەرموو چاودێریی قورئان بینە بۆ بیرە ساکار و ڕوانینە سادە و وردنەبینەکانی ئەوان..

سەیر بکە و بزانە چۆن ئەم قورئانە پیرۆزە هەمیشە ئەو جۆرە ئایەتە ڕوون و ئاشکرایانە بە چڕی و زۆری دووپات دەکاتەوە کە بەسەر ڕووی ئاسمانەکان و زەوییەوە بە زەقی نووسراون و، ئەو پیتە درشت و مەزنانەیان پێ دەخوێنێتەوە کە هەر زۆر بە ئاسانی دەخوێنرێنەوە، چەشنی: بەدیهێنانی زەوی و ئاسمانەکان و، هێنانەخوارەوەی ئاو لە بەرزایی ئاسمان و زیندوو کردنەوەی زەوی و، ئایەتەکانی تری هاوچەشنی ئەمانە..

کەچی بە دەگمەن نەبێت سەرنجی بینەران بۆ ئەو پیتە بچووکانە ڕاناکێشێت کە بە وردی لەناو پیتە گەورەکاندا نووسراون، تاکو خوێندنەوەی ئەو پیتانەیان بەلاوە کارێکی دژوار نەبێت!

پاشان سەیری " تونلوتۆلی"ی ڕوونکردنەوەکانی قورئانی پیرۆز و "ڕەوانی" و "سروشتی"ی شێوازەکەی بکە، چۆن ئەو ئایەتانە بەسەر مرۆڤدا دەخوێنێتەوە کە توانستی خوای گەورە لەناو لاپەڕەکانی بوونەوەراندا نووسیونی، بە ڕادەیەك کە دەڵێی قورئانی پیرۆز بریتییە لە:

خوێندنەوەی کتێب و ڕێساکانی ناو گەردوون و..

کاروبارەکانی بەدیهێنەری نەخشەکێشی ئەو گەردوونە و..

کارە سەرانسەر دانستەکانی خواوەند لەناو گەردووندا!

ئەگەر دەتەوێت ئەمەت بۆ دەربکەوێت، ئەوا فەرموو بە دڵێکی بینەری بێدار گوێ لەو فەرمایشتەی قورئانی پیرۆز ڕابگرە کە دەفەرموێ:

﴿عَمَّ يَتَسَاءلُونَ﴾ (النبأ:١) و..

﴿قُلِ اللَّهُمَّ مالِكَ المُلْكِ﴾ (آل عمران:٢٦) و..

ئایەتەکانی تری هاوچەشنیان.

## یادخەرەوەی دوازدەهەم

ئەی ئەو خۆشەویستانەم کە گوێ لەم یادخەرەوانە ڕادەگرن!

بزانن:

من هەندێ جار لالآنەوەکانی دڵی خۆم دەنووسم کە بۆ پەروەردگاریان دەکەم، هەرچەند دەبوو بشاررانایەتەوە و نەنووسرانایە. چونکە لە میهرەبانیی خوای گەورە ئومێدەوارم کە کاتێ مردن زمانمی بێدەنگ کرد، گوفتاری نووسینەکەمم لە بریی زمانم لێ وەربگرێت.

بەڵێ، تۆبەی زمانم لەم تەمەنە کورتەمدا هەموو گوناهە زۆرەکانم ناگرێتەوە و فریایان ناکەوێت. لەبەر ئەوە، دەمکردنەوەی نووسینە چەسپاو و بەردەوامەکەم دەتوانێت هەموو ئەو گوناهانە بەسەر بکات و بیانگرێتەوە!

ئەوەبوو سیازدە ساڵ پێش ئێستا و، لە کاتی شڵەژانێکی مەزنی باری ڕۆحی و گۆڕانی پێکەنینی "سەعیدی کۆن" بۆ گریانی "سەعیدی نوێ" بە بەرەبەیانی پیری لە خەوی شەوگاری لاوی بێداربوومەوە و، لەم موناجات و لالآنەوەیەم بە عەرەبی نووسی، کە ئەمە واتای هەندێکیەتی:

ئەی پەروەردگاری میهرەبان و خواوەندی بەخشندەم!

بەهۆی ئەوەی کردەوەی خراپم هەڵبژارد، تەمەن و لاویم لەدەست دەرچوو، لەو بەرهەمانەشیان کە لە دەستمدا ماون، تەنها گوناهە پڕ ئێش و ئازارەکانیانە کە مرۆڤ ڕسوا و شەرمەزار دەکەن و زیانی پێ دەگەیەنن و لە

ڕێ لایدەدەن و، چەند وەسوەسەیەکن مرۆڤ بێزار و دەستەپاچە و کۆڵەوار دەکەن.

خۆ منیش بە بینین بۆم دەرکەوتووە کە بەوپەڕی پەلە و خێرایی و بێ هیچ لادان و ویستێکی خۆم و، بە چەشنی باوك و باپیران و خۆشەویستان و خزمان و هاوڕێیانم، لە دەرگای گۆڕ نزیك بوومەتەوە، کە خانەی تەنیاییە لە ڕێگای هەمیشەییدا، بۆ لێکدابڕانی هەتاهەتایی لەم خانەیەی کە بە دڵنیایی دەزانم خانەیەکی فانی و تیاچووە و، وەك بینراوە هەردەم لە ئاوابوون و کۆچکردندایە، بە تایبەت بۆ یەکێکی وەك منی خاوەن نەفسی بەدخوازی غەددار و فێڵباز.

دەسا ئەی پەروەردگاری میهرەبان و بەخشندەم!

بەم نزیکانە، دەبینم کفنەکەمم پۆشیوە و ڕۆشتوومەتە ناو تابووتەکەم و ماڵئاواییم لە خۆشەویستانم کردووە و، ڕووەو دەرگای گۆڕەکەم کەوتوومەتە ڕێ. وا لە دەرگانەی میهرەبانیی تۆدا دەلالێمەوە و هاوار دەکەم:

الأمان.. الأمان.. یا حنان یا منـــان! لە خەجاڵەتیی بێ گوێیی کردنت ڕزگارم بکە..

ئاخ.. وا کفنەکەم بە ئەستۆمەوەیە و لەسەر قەبرەکەم ڕاوەستاوم و سەرم بۆ دەرگانەی بەزەییت بەرز دەکەمەوە و، هانات بۆ دەهێنم و دەڵێم:

الأمان.. الأمان.. یا رحمن یا حنان! لە قورسیی باری گوناھـ ڕزگارم بکە.

ئاخ.. وا من بە کفنەکەم پێچراومەتەوە و، لە گۆڕەکەمدا نیشتەجێ بووم و ڕەوانەکەران بەجێیان هێشتووم و، چاوەڕێی لێبوردن و میهرەبانیتم و، بە چاو دەبینم کە جگە لای تۆ هیچ پەنا و داڵدەیەك نییە و، هاوار دەکەم:

الأمـــان.. الأمـــان.. لەدەست تەنگیی جێگا و بێ هاودەمیی ئەنجامی تاوانباری و، لە دەست ناشیرینیی ڕووی گوناهەکان..

یارحمن.. یاحنان.. یامنان.. یادیان! لە هاوەڵێتیی گوناهـ و تاوان ڕزگارم بکە.

ئەی خوای گەورەم!

تەنها میهرەبانی و بەزەیی تۆ دالـدە و پەنامە، سکاڵای خەم و پەژارەشم هەر تەنها بۆ لای تۆیە.

ئەی بەدیهێنەری بەخشندە و پەروەردگاری میهرەبان و گەورەم!

ئەم سـەعیدە بەندە و بەدیهێنراوەی خـۆت، کـە هـەم گوناهبـار، هـەم کۆڵەوار و بێ دەستەڵات، هەم بێ ئاگا، هەم نەزان، هـەم بیمـار، هـەم زەلیـل، هەم خراپکـار، هـەم بەسـاڵاچوو، هـەم بەدبەخت و، هـەم لـە گـەورەی خـۆی هەڵـهاتوو.. وا دوای چـل سـاڵی هەڵـهاتن، گەڕاوەتـەوە و هانـا و پـەنای بـۆ میهرەبانیی تۆ هێناوە و، دان بـە تـاوان و گوناهـەکانیدا دەنێـت و، گرفتـاری چەندین وەهم و نەخۆشی بووە و، لێت دەپاڕێتەوە..

جا ئەگەر وەری بگریت و لێی خۆش ببیت و بەزەییت پێدا بێتەوە، ئەوا تۆ ئەهل و شایانی ئەوەیت و لە هەموو میهرەبانێك میهرەبانتریت..

دەنا پەنا بۆ چ دەرگایەکی جگـە لـە دەرگـای تـۆ بـبات؟ لـە کـاتێکدا کـە تەنها تۆ پەروەردگاری مەبەست و حەقی پەرستراویت؟

لا إله إلاّ أنت وحدك لا شريك لك.

آخر الكلام في الدنيا وأول الكلام في الآخرة وفي القبر:

أشهد أن لا إله إلاّ الله، وأشهد أنّ محمداً رسول الله، صلى الله تعالى عليه وسلم.

## یادخەرەوەی سیازدەهەم

ئەم یادخەرەوەیە بریتی‌یە لە پێنج مەسەلەی تەماوی و تێکەڵ کە پێویستیان بە ڕوونکردنەوە هەیە:

◆ مەسەلەی یەکەم:

ئەوانەی کە لە ڕێی حەقدا کاردەکەن و لە پێناویدا تێدەکۆشن، لە کاتێکدا کە دەبوو تەنها بیر لە کار و ئەرکی سەرشانی خۆیان بکەنەوە، کەچی بیر لە چەند کار و تەگبیرێکی ئەوتۆ دەکەنەوە کە تایبەتن بە خوای گەورەوە و، هەموو ئیش و کارێکیان لەسەر ئەو بناغەیە بنیات دەنێن، ئیتر لە ئەنجامدا بە هەڵەدا دەچن!

کتێبی: (أدب الدنيا والدين) دەگێڕێتەوە کە[1]: جارێکیان شەیتانی لەعنەتی خۆی پیشانی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - دا و پێی وت:

"ئایا تۆ نالێیت ئەوەی خوا لە چارەتدا نەینووسیبێت نایەتە ڕێت"؟

حەزرەتی عیسا فەرمووی:

"بەڵێ".

شەیتانی لەعنەتی وتی:

"کەواتە لەسەر لوتکەی ئەم چیایەوە خۆت فڕێ بدەرە خوارەوە، چونکە ئەگەر لە چارەنووستدا ساغ و سەلامەتیت بۆ نووسرابێت، ئەوا هیچت لێ نایەت"!

حەزرەتی عیسایش فەرمووی:

---

(١) بڕوانە: "أدب الدنيا والدين" لأبي الحسن علي بن محمد الماوردي. تحقيق: مصطفى السقا. ص ٢٧ الطبعة الثانية. (وەرگێڕ)

"له‌عنه‌تی! خوا بۆی هه‌یه به‌نده‌ی خۆی تاقی بكاته‌وه، به‌ڵام به‌نده بۆی نی‌یه په‌روه‌ردگاری خۆی تاقی بكاته‌وه"!

واته: خوای گه‌وره بۆی هه‌یه به‌نده‌ی خۆی تاقی بكاته‌وه و پێی بفه‌رموێ: ئه‌گه‌ر فلانه كار ئه‌نجام بده‌یت ئاوا پاداشتت ده‌ده‌مه‌وه، ئه‌وه‌تا له تواناشتدا هه‌یه بیكه‌یت، به‌مه‌ش ئه‌و به‌نده‌یه‌ی خۆی تاقی ده‌كاته‌وه. به‌ڵام به‌نده مافی ئه‌وه‌ی نی‌یه، ته‌نانه‌ت هه‌ر له تواناشیدا نی‌یه په‌روه‌ردگاری خۆی تاقی بكاته‌وه و بڵێت: وا كاره‌كه‌م ئه‌نجام دا، ئایا تۆش فلانه كارم بۆ ده‌كه‌یت؟

ئه‌م شێوازه گوفتارانه‌ی كه ئاماژه‌یان تێدایه بۆ تاقیكردنه‌وه‌ی خوای گه‌وره، له ڕاستیدا بێ‌ئه‌ده‌بی‌یه له به‌رامبه‌ر په‌روه‌ردگاریێتیی خوای گه‌وره و، پێچه‌وانه‌ی ڕه‌وپه‌ی به‌ندایه‌تی‌یه.

جا مادهم وایه، ئه‌وا ده‌بێ مرۆڤ ئه‌رك و واجبی خۆی به‌جێ بهێنێت و خۆی له كارسازی و قه‌ده‌ری خوای گه‌وره‌دا هه‌ڵنه‌قورتێنێت.

جه‌لاله‌ددین خوارِه‌زم شا، كه یه‌كێكه له پاڵه‌وانانی ئیسلام و چه‌ندین جار به‌سه‌ر سوپای جه‌نگیزخاندا سه‌ركه‌وتنی به‌ده‌ست هێناوه، له جه‌نگه‌كانیدا هه‌میشه ده‌كه‌وته پێش سوپاكه‌یه‌وه. وه‌زیران و نزیكانی پێیان وت: خوای گه‌وره به‌سه‌ر دوژمنانتدا سه‌رت ده‌خات!

وه‌ڵامی دانه‌وه و پێی وتن:

ئه‌وه‌ی ئه‌ركی سه‌رشانی منه: جیهادكردنه له پێناوی خوای گه‌وره‌دا بۆ ئه‌وه‌ی فه‌رمانی خواوه‌ند به‌جێ بهێنم و شوێنی بكه‌وم. ئیتر من كارم به‌سه‌ر شتێكه‌وه نی‌یه كه ئیشی خوای گه‌وره خۆیه‌تی و نه‌خراوه‌ته ئه‌ستۆی منه‌وه. چونكه چ سه‌ركه‌وتن و چ شكست هێنان هه‌ردووكیان كاری ته‌قدیری خوای گه‌وره‌ن.

جا لەبەر ئەوەی ئەم پاڵەوانە لەم نهێنییە وردەی تەسلیم بوون و ملکەچ کردن بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە تێگەیشتبوو، ئەوا زۆربەی جار و بە شێوەیەکی دەراسا لە جەنگەکانیدا سەردەکەوت.

بەڵێ، نابێ مرۆڤ بە بۆنەی ئەو جوزئە ئیختیارییەی کە هەیەتی بیر لە ئەنجامی کارەکان بکاتەوە، کە خوای گەورە خۆی ئەو ئەنجامانە دەسازێنێت.

بۆ نموونە: هەندێ لە برایان شەوق و حەماسەتیان بۆ پەیامەکانی نوور زیاد دەبێت کاتێ کە خەڵکی بەدەم ئەم پەیامانەوە بێن و سوودیان لێ وەربگرن، دەبینیت ئەم برایانە لەم جۆرە کاتانەدا پتر چالاکی دەنوێنن، بەڵام کاتێ خەڵکی بەدەم ئەم پەیامانەوە ناچن، ورە و هێزی مەعنەویی لاوازان سست دەبێت و بڵێسەی شەوق و تاسەمەندییان دەکوژێتەوە.

کەچی پێغەمبەر ﷺ کە مامۆستای هەرە مەزن و پێشەنگی هەموان و پێشەوای هەرە بەرزی ئیماندارانە، ئەم فەرمانەی خواوەندی کردبوو بە رابەری خۆی کە دەفەرموێ:

﴿وما على الرسولِ إلاّ البلاغُ المبين﴾ (النور:٥٤).

ئەوەبوو هەتا خەڵکی پشتیان لێ هەڵبکردایە و گوێیان لێ رانەگرتایە و دوور بکەوتنایەتەوە لێی، لەو لە پێناوی راگەیاندنەکەیدا پتر تێدەکۆشا و زیاتر جیهادی دەکرد. چونکە بە دڵنیاییەوە دەیزانی گوێڕایەڵیی خەڵکی و هیدایەتدانیان کاری خوای گەورەیە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزەی کە دەفەرموێ:

﴿إنّكَ لا تـهدي مَنْ أحبَبْتَ ولكنّ الله يهدي مَنْ يشاء﴾ (القصص:٥٦).

ئیتر ئەم پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ هەرگیزاو هەرگیز دەستی نەدەخستە ناو کاروباری خوای گەورەوە.

ده‌سا برایانم! خۆتـان لـه‌ ئیشـو كارێكدا هه‌ڵمه‌قورتێنن كـه‌ پـه‌یوه‌ندیی پێتانه‌وه‌ نی‌یه‌ و، كاره‌كانتـان له‌سه‌ر ئه‌و بناغانه‌ بنیات مه‌نێن و، لـه‌ بـارێكی وه‌هادا مه‌بن كه‌ ئه‌وه‌ بگه‌یه‌نێت به‌دیهێنه‌رتان تاقی بكه‌نه‌وه‌.

◆ مه‌سه‌له‌ی دووهه‌م:

"مه‌به‌ست" له‌ خواپه‌رستیدا جێبه‌جێ كردنی فه‌رمانه‌كانی خوای گه‌وره‌ و ده‌ستكه‌وتنی ڕه‌زامه‌ندی‌یه‌تی. كه‌واته‌ ئه‌وه‌ی داخوازی په‌رستنه‌ جێبـه‌جێ كردنی فه‌رمانی خـوای گه‌وره‌یه‌ و، ئه‌نجامه‌كه‌شـی ده‌ستكه‌وتنی ڕه‌زامه‌ندیی ئه‌وه‌ و، به‌روبووم و سووده‌كانیشی لـه‌ دواڕۆژدان. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شـدا، ئه‌گه‌ر سـوودی هـه‌ندێ لـه‌و به‌روبوومانه‌ لـه‌م دنیـادا بـه‌ مـرۆڤ ببه‌خشـرێن، نابێتـه‌ كارێكی پێچه‌وانه‌ی خواپه‌رستی، به‌ مه‌رجێ ده‌ستكه‌وتنی ئـه‌م سـووده‌ نـه‌بێت به‌ هۆكاری سه‌ره‌كی و مه‌به‌ستی ئه‌نجامدانی ئه‌و په‌رستنه‌!

كه‌واتـه‌ ئـه‌و سـوود و به‌روبوومانـه‌ی كـه‌ لـه‌ ئـه‌نجامی خواپه‌رستنه‌وه‌ و بێ داواكردنیان به‌ مرۆڤی ئیمـاندار ده‌به‌خشـرێن، دژی خواپه‌رسـتی نین، بـه‌ڵكو وه‌ك هانده‌ر و شه‌وق به‌خش وان بۆ مرۆڤه‌ لاوازه‌كان.

به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئه‌و سوودانه‌ی دنیا ببن بـه‌ "هۆ" یـان به‌شێك لـه‌ "هۆ"ی ئـه‌و په‌رستنه‌، یـان ئـه‌و ویرده‌، یـان ئـه‌و زیكـره‌، ئـه‌وا به‌شێك لـه‌و په‌رستنه‌ بـه‌تاڵ ده‌بێته‌وه‌. ته‌نانه‌ت ئه‌و ویرده‌ی كه‌ چه‌ندین تایبه‌تكاریی زۆری هه‌یه‌، بـه‌م نیـازه‌ وای لـێ دێت هیچ ئه‌نجامێكی نامێنێت.

جا ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ له‌م نهێنی‌یه‌ تێنه‌گه‌یشتوون و "ئـه‌ورادی قودسـیه‌"ی شاهی نه‌قشبه‌ند - كه‌ دارای سه‌دان تایبه‌تكاری‌یه‌ - یان "الجوشـن الكبـير" - كه‌ هه‌زاران چاكه‌ و تایبه‌تكاریی تێدایـه‌ - ته‌نـها بـه‌ نیـازی ده‌ستكه‌وتنی ئـه‌و سوودانه‌ ده‌خوێنن، ئه‌وا ئه‌و سـوودانه‌یان ده‌سـتگیر نـابێت، بـه‌ڵكو هـه‌رگیزاو هه‌رگیز ناگونجێ ده‌ستیان بكه‌وێت و بیانبینن و به‌ هیچ جۆرێـك مـافی بینینی

ئەو سوودانەیان نییە. چونکە نابێ ئەو سوودانە هۆی خوێندنی ئەو ویردانە بن، کەواتە نابێ ڕاستەوخۆ ئامانج و مەبەست بن لەو خوێندنەدا، لەبەر ئەوەی ئەو سوودانە فەزڵێکی خوای گەورەن لە ئەنجامی خوێندنی ئەو ویردانەوە کە بە جۆرێکی بێگەرد و بە بێ مەبەستی داوا کردنی هیچ شتێك خوێنرابن، خوای گەورە دەیانبەخشێت.

خۆ ئەگەر خوێنەری ئەم ویردانە ئەو سوودانەی لە نیازدا بوو، ئەوا ئەم نیازەی هەندێ لە "ئیخلاس"ەکەی دەشێوێنێت و تێکی دەدات، تەنانەت لە بازنەی "پەرستن" دەیهاوێتەدەر. دیارە ئەو کاتەش بەهای ئەو ویردانە نامێنێت.

بەڵام هەندێ کەسی لاواز هەن کە هەمیشە پێویستیان بە شەوق و هاندانە. جا ئەگەر یەکێك لەوانە ئەو ویردانەی بە نیازێکی خاوێن بۆ خوای گەورە خوێند و لە هەمان کاتدا ئەو سوودانەشی لە یاددا بوو، ئەوا زیانی نییە و لێی وەردەگیرێت.

جا لەبەر تێنەگەیشتن لەم حیکمەتە، زۆر کەس دووچاری گومان و دوودڵی دەبن کاتێ ئەم ویردانە دەخوێنن و ئەو سوودانەشیان دەست ناکەوێت کە لە قوتب و پیاوچاکە پێشینەکانەوە ڕیوایەت کراون، بگرە لەوانەیە ئینکاریشیان بکەن.

◆ مەسەلەی سێهەم:

"طوبى لمن عرف حده و لم يتجاوز طوره"[1].

"خۆر" لە هەموو شتێکدا دەدرەوشێتەوە و دەردەکەوێت، هەر لە بچووکترین گەردیلە و وردە شووشە و دڵۆپی ئاو و حەوز و کانی و دەریای مەزنەوە، تا دەگاتە مانگ و هەسارە گەڕۆکەکان. هەر یەك لەمانەش

(١) خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی لە سنووری خۆی لانادات. (وەرگێڕ)

سنووری خۆیان دەزانن و بەپێی توانا و لێهاتنیان تیشکدانەوە و شێوەی "خۆر" لەسەر ڕووی خۆیاندا مۆر دەکەن.

بۆ نموونە:

دڵۆپێك ئاو دەتوانێت بڵێت: تیشکدانەوەی خۆرم لەلایە. ئەمەش بەپێی لێهاتنی خۆی. بەڵام پرکێشیی ئەوە ناکات کە بڵێت: من بە چەشنی دەریا ئاوێنەی خۆرم!

مەقامەکانی ئەولیاش بە هەمان جۆرن؛ ئەوانیش بە گوێرەی جۆراوجۆریی درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورە، چەندین پلەی زۆر و زەبەندەیان هەیە. چونکە هەموو یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە - وەك خۆری ناو نموونەکە - چەندەها درەوشانەوەیان هەیە، هەر لە "دڵ"ەوە تا دەگاتە "عەرش". "دڵ"یش عەرشە، بەڵام ناتوانێت بڵێت: "من وەك عەرشی ئەعزەم وام".

جا ئەو کەسەی لە ڕێی شانازی و لەخۆباییبوونەوە سلووك دەکات، ئا لێرەوە ئەمەی لێ دەئاڵۆزێت و دڵە هەرە بچووکەکەی خۆی، کە وەك گەردیلە وایە، لەگەڵ عەرشی ئەعزەمدا بە یەك چاو تەماشا دەکات و، ئەو پلە بچووکەی خۆیشی، کە وەك دڵۆپێك وایە، بە هاوشانی پلەی ئەولیا مەزنەکان دادەنێت کە وەك دەریا وایە.

لە کاتێکدا کە دەبوو هەموو خەم و توانایەکی بۆ زانین و ناسینی بناغەی خواپەرستی تەرخان بکردایە، کە بریتی‌یە لە: کۆڵەواری و، هەژاری و، هەست کردن بە قسوور و ناتەواویی خۆی لە بەردەم بەدیهێنەری بەتوانا و، لاڵانەوە لە دەرگانەی خوایەتیی خوادا و، سوژدەبردن لەو دەرگانەیەدا بەوپەڕی زەلیلی و ملکەچی بۆ خوای گەورە..

لە کاتێکدا دەبوو ئەمەی بکردایە، کەچی دەبینیت ڕێی شانازی کردن و لەخۆ بایی بوون دەگرێتەبەر! ئنجا بۆ ئەوەش کە لەگەڵ ئەو پلەوپایە بەرزانەدا خۆی بگونجێنێت و پارێزگاریی ئەم خۆگونجاندنەی بکات، تەکەللوفی پێوە دەردەکەوێت. لەمەشەوە دەکەوێتە ناو کاری بێ سوودی وەك: غرور و خۆویستی و گیروگرفتی سەختەوە.

بە کورتی:

لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە کە:

"هلك الناس إلاّ العالمون، وهلك العالمون إلاّ العاملون، وهلك العـــاملون إلاّ المخلِصون، والمخلِصون على خطر عظيم"(١).

واتە: تەوەرە و خولگەی ڕزگاربوون تەنها هەر ئیخلاسە. کەواتە دەستکەوتنی ئیخلاس لەوپەڕی گرنگیدایە.

چونکە ئەوەندەی گەردیلەیەك کردەوەی خاوێن و بێگەرد لای خوای گەورە لە چەندەها تەن کردەوەی خڵتاوی باشترە.

مرۆڤیش بەوە ئیخلاسی دەست دەکەوێت کە بیر بکاتەوە و بزانێت: هاندەری ئەو کارانەی دەیانکات تەنها "بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوایە" نەك شتی تر. ئەنجامەکانیشیان تەنها "ڕەزامەندیی خوای گەورەیە" و، ئنجا بەوە دەبێت ئەو مرۆڤە لە ئیشوکاری خوای گەورەدا خۆی هەڵنەقورتێنێت.

هەموو شتێك ئیخلاسی تێدایە، تەنانەت خۆشەویستیی بێ گەردی بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە چەندەها تەن خۆشەویستیی ڕواڵەتی باشترە.

شاعیرێك ئەم جۆرە خۆشەویستی‌یەی بەم بەیتە شیعرە دەربڕیوە کە دەڵێت:

---

(١) کتێبی "كشف الخفاء" فەرموودەی ژمارە (٢٧٩٦) دەڵێت: "قال الصغاني: وهذا الحديث مفترى ملحون، والصواب في الإعراب: العالمين والعاملين والمخلصين". (لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

وما أنا بالباغي على الحُبِ رشوةً ضعيفٌ هــوى يُبغى عليه ثوابُ

واتـه: له‌ســه‌ر ئـه‌م خۆشـه‌ویستی‌یه‌م داوای هیـچ بـه‌رتیل و پاداشــت و خـه‌ڵات و به‌خششـێك ناكـه‌م، چونكـه ئـه‌و خۆشه‌ویسـتی‌یه‌ی داواكـاری پاداشت و خه‌ڵات بێـت، خۆشه‌ویسـتی‌یه‌كی لاوازه و بـه زوویـی كۆتـایی پێ دێت.

خوای گـه‌وره، ئه‌م خۆشه‌ویستی‌یه بێگـه‌رده‌ی لـه سروشتی مرۆڤـدا بـه تایبه‌تیش له سروشتی تێكڕای دایكاندا، داناوه. شـه‌فه‌قه‌تی دایـك نموونه‌یـه‌كی ئاشكرا و به‌رجه‌سته‌ی ئه‌م خۆشه‌ویستی‌یه بێگه‌رده‌یه.

به‌ڵگـه‌ش له‌سـه‌ر ئـه‌وه‌ی كـه دایكـان هـه‌رگیز داوای بـه‌رتیل و پاداشــت و خـه‌ڵات ناكـه‌ن به‌رامبـه‌ر خۆشویستی منداڵـه‌كانیان، ئه‌وه‌یه كـه: لـه پێنــاوی منداڵـه‌كانیاندا خۆیـان بـه‌خت ده‌كـه‌ن، بـه‌ڵكو هــه‌ندێكیان لــه‌و پێنــاوه‌دا دواڕۆژیشیان داده‌نێن! ته‌نانـه‌ت به چاوی خۆت ده‌بینیـت كـه "مریشـك" په‌لاماری "سه‌گ" ده‌دات تـاكو جووجه‌ڵه‌كه‌ی لـه ده‌مـی ئـه‌و سـه‌گه ڕزگـار بكـات - وه‌ك خه‌سره‌و بـه چـاوی خــۆی بینیـی - ئاشكرایشـه كـه هـه‌موو سه‌رمایه‌كه‌ی بریتی‌یه له ژیانه‌كه‌ی، كه‌چی له‌و پێناوه‌دا به‌ختی ده‌كات!

◆ مه‌سه‌له‌ی چواره‌م:

ئه‌و نیعمه‌تانه‌ی كه له ڕێی هۆكارێكی تایبه‌تی‌یه‌وه بۆ مـرۆڤ دێـن، نـابێت بـه حسـابی ئـه‌و هۆكاره ڕواڵه‌تی‌یانــه وه‌ربگـیرێن، چونكـه ئـه‌و هۆكـاره‌ی نیعمه‌ته‌كه‌ی له ڕێگاوه دێت یان دارای ئیختیاره، یان بێ‌ئیختیاره. جـا ئه‌گـه‌ر چه‌شنی ئاژه‌ڵ و ڕووه‌ك بێ ئیختیار بوو، ئـه‌وا هیـچ گومـانێكی تێـدا نی‌یـه كـه ئه‌و نیعمه‌ته‌ت به حساب و به ناوی خوای گه‌وره‌وه ده‌داتێ. مادام ئـه‌و كاتێ نیعمه‌ته‌كه‌ت پێشكه‌ش ده‌كات به زمانی حاڵ ناوی خوای گـه‌وره ده‌هێنێـت،

واتە ﴿بسمِ اللهِ﴾ دەکات و ئنجا دەتداتێ، ئەوا تۆیش بە ناوی خوای گەورەوە وەری‌بگرە و بیخۆ.

بەڵام ئەگەر ئەو هۆکارە خاوەنی ئیختیار بوو، ئەوا دەبێ ناوی خوا بهێنێت و بڵێت: ﴿بسمِ اللهِ﴾. هەتا ئەو ناوی خوای لێ نەهێنێت تۆ هیچی لێ وەرمەگرە. چونکە واتای ئاماژەیی – سەرباری واتای ڕاشکاوی – ئایەتی پیرۆزی: ﴿ولا تأكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ﴾ (الأنعام:١٢١) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەر نیعمەتێك ناوی خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی لەسەر نەهێنرابێت، کە خوای گەورەیە و، بە ناوی ئەو خوایەوە بەدەستتان نەدرابێت، ئێوە لێی مەخۆن.

بەم پێیە، دەبێ بەخشەر و وەرگر – هەردووکیان – ناوی خوا بهێنن. خۆ ئەگەر بەخشەر ناوی خوای نەدەهێنا و تۆیش گەلێ موحتاجی وەرگرتنی ئەو نیعمەتە بوویت، ئەوا تۆ ناوی خوای لێ بهێنە و وەری‌بگرە. بەڵام لەو کاتەدا کە وەری دەگریت لە سەرووی دەستی بەخشەرەوە دەستی "میهرەبانیی خواوەند" ببینە کە ئەو نیعمەتەی بە تۆ و بەویش بەخشیوە. ئنجا ئەو دەستی میهرەبانی‌یە بە "شوکرانە بژێری" ماچ بکە و نیعمەتەکەی لێ وەربگرە. واتە لە ناوەندی نیعمەت بەخشیندا یادی نیعمەت بەخشی ڕاستەقینە بکەرەوە.

لە ڕاستیدا "شوکرانەبژێری" بریتی‌یە لەم ڕوانین و یادکردنەوەیە.

پاشان – ئەگەر ویستت – ئاوڕێك لە هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکە بدەرەوە و دوعای خێر و ستایشی بۆ بکە، لەبەر ئەوەی کە نیعمەتەکەت لەسەر دەستی ئەودا پێگەیشتووە.

ئەو شتەی هۆکارپەرستان دەخاتە هەڵەوە و لە خشتەیان دەبات، ئەوەیە کە هەرکات دەبینن دوو شت بە یەکەوە دێن یان پێکەوە پەیدا دەبن، وا

گومان دەبەن كە یەكێكیان "هۆكار"ی "بوون"ی ئەوی تریان بێت. كە ئەمەش پێی دەوترێت: "إقتران" واتە: "پێكەوەیی" یان "هاودەمی"..

جا لەبەر ئەوەی كە "نەبوون"ی شتێك دەبێت بەهۆی "نەبوون"ی نیعمەتێك، ئەوا مرۆڤ وا گومان دەبات كە بە هەمان جۆر "بوون"ی ئەو شتەش هۆی "بوون"ی ئەو نیعمەتەیە و، ئنجا سوپاسگوزاری پێشكەش بەو شتە دەكات و بەو پێیە دەكەوێتە هەڵەوە. هەڵەكەشی لەوەدایە كە نازانێت "بوون"ی هەر نیعمەتێك - لە ڕاستیدا - ئەنجامی چەندین پێشەكی و هەل و مەرجی زۆر و زەبەندەیە، بەڵام "نەبوون"ی ئەو نیعمەتە تەنها بە نەهاتنەدیی یەك دانە لەو هەل و مەرجانە ڕوو دەدات!

بۆ نموونە: ئەگەر كەسێك جۆگەی ئاوی باخچەكەی نەكاتەوە، دیارە ئەم كارەی دەبێت بەهۆی وشك بوون و مردنی باخچەكەی، پاشان "فەوتان" و "نەمان" و "نەبوون"ی ئەو نیعمەتانەی كە لەو باخچەیەدان. بەڵام "بوون"ی ئەو نیعمەتە زۆرانەی باخچەكە تەنها پشتیان بە ئاوبەردانەوەی ئەو كەسە نەبەستووە، بەڵكو لەگەڵ ئەو مەرجەشدا پشتیان بە سەدان هەل و مەرجی تر بەستووە كە دەبێ "هەموویان" بێنەدی. تەنانەت هێشتا جگە لە هاتنەدیی هەموو ئەوانەش، بە بێ هۆكاری ڕاستەقینە، كە توانستی پەروەردگاری و ویستی خواییە، هەرگیز ئەو نیعمەتانە نایەنەدی!

بۆ خۆت لەم نموونەیەوە مەودای ئەو چەوتی و چەواشەییە بزانە كە لەم هەڵەیەدا هەیە و، ئنجا لە تاوان و سووچی هۆپەرستان تێبگە!

بەڵێ "إقتران" و "هۆ" دوو شتی لەیەكتر جیاوازن.

بۆ نموونە: ئەو نیعمەتەی هاودەم لەگەڵ "نیازی چاكەكاری"ی كەسێكدا ڕووت تێ دەكات، "هۆ"كەی میهرەبانیی خواوەندە. نیازەكەی ئەویش

جگە لە "إقتران" هیچی تری لە هێنانی ئەو نیعمەتەدا نەبووە و، هەرگیز ئەو نیازە "هۆ"ی "بوون"ی ئەو نیعمەتە نییە.

بەڵێ ڕاستە، ئەگەر ئەو کەسە نیازی ئەو چاکەکارییەی نەبوایە کە لەگەڵ تۆدا بیکات، ئەو نیعمەتە بۆ تۆ نەدەهات. واتە "نەبوون"ی ئەو نیازە دەبوو بەهۆی "نەبوون"ی ئەو نیعمەتە. بەڵام "بوون"ی مەیل و نیازی چاکەکارییەکەی ئەو هەرگیز "هۆ"ی "بوون"ی نیعمەتەکە نییە، لەوانەیە مەرجێك بێت لە نێوان سەدان مەرجی تردا.

هەندێ قوتابیی نوور لەوانەی کە خوای گەورە بەخشش و نیعمەتی زۆری بەسەردا باراندوون، وەك "خەسرەو" و "ڕەئفەت" کەوتنە لەم هەڵەیەوە و، "إقتران" و "هۆ"یان لێ ئاڵۆزا. ئەوەبوو لەڕادەبەدەر ڕەزامەندییان لە مامۆستاکەیان دەردەبڕی و سوپاسیان پێشکەش دەکرد.

کەچی لە ڕاستیدا خوای گەورە نیعمەتی سوودوەرگرتنی ئەوانی لە دەرسەکانی قورئان "هاودەم کردبوو" لەگەڵ ئەو چاکەکارییەی کە بە مامۆستاکەی ئەوانی بەخشیبوو و بریتی بوو لە نیعمەتی سوودگەیاندن بەوان. کەواتە مەسەلەکە جگە لە هاودەمی (إقتران) هیچی تر نییە..

ئەوان دەڵێن: ئەگەر مامۆستامان بۆ ئێرە نەهاتایە ئێمە ئەم دەرسە ئیمانییەمان لەکیس دەچوو. کەواتە سوودگەیاندنی ئەو بە ئێمە "هۆ"ی سوودوەرگرتنی ئێمەیە.

منیش دەڵێم:

برا خۆشەویستەکانم! خواوەندی حەق ئەو نیعمەتەی کە بە منی بەخشیوە "هاودەم" لەگەڵ ئەو نیعمەتەدا ناردوویەتی کە بە ئێوەشی بەخشیوە. "هۆ"ی هەردوو نیعمەتەکە تەنها "میهرەبانیی خوای گەورەیە".

ڕۆژێکیان هەستم بە منەتباری‌یەکی زۆر دەکرد بەرامبەر چەند قوتابی‌یەك لەوانەی کە خاوەنی قەڵەمی کارامەی وەك ئێوە بوون و لە خزمەتگوزاریی نووردا تێ‌دەکۆشان. منیش بە هەمان جۆر "إقران"و "هۆ"م لێ ئاڵۆزا و، دەموت: گەر ئەو قوتابی‌یانە نەبوونایە بەکێکی خەت ناخۆشی وەك من چۆن دەیتوانی ئەرکی خزمەتگوزاریی قورئان ڕاپەڕێنێت؟

بەڵام پاش ئەوە تێگەیشتم کە خوای گەورە دوای ئەوەی نیعمەتی "خەت خۆشی"ی بە ئێوە بەخشی، نیعمەتی "تەوفیق"یشی لەم خزمەتگوزاری‌یەی قورئانی پیرۆزدا بە من بەخشی. کەواتە هەردوو کارەکە "پێکەوە" و بە "هاودەمی" هاتنە پێش و هیچ کامیان هۆی هاتنی ئەوی تریان نی‌یە.

لەبەر ئەوە، من سوپاسی خۆم پێشکەشی ئێوە ناکەم، بەڵکو لە بریی ئەوە، مژدەتان دەدەمێ و پیرۆزباییتان لێ دەکەم. دەسا ئێوەش لە بریی ڕەزامەندی و سوپاسگوزاری بەرامبەر بە من، دوعا و نزای سەرکەوتن و بەرەکەتم بۆ بکەن.

لەم مەسەلەیە تەرازوویەکی وردی سەرنەکەری تێدایە، پلەکانی بێ ئاگایی و شیرکی پەنهانی پێ دەزانرێت.

◆ مەسەلەی پێنجەم:

هەروەك ئەگەر موڵکی "کۆمەڵ" بدرێت بە "یەك کەس" بە ستەمێکی مەزن لە قەڵەم دەدرێت و..

گەر کەسێك شتێکی تایبەت بە کۆمەڵەوە زەوت بکات، ئەوا ستەمێکی گەلێ ناشیرین بەرامبەر بە کۆمەڵەکەی دەکات..

بە هەمان جۆر:

ئەو "ئەنجامانە"ش کە هی هەوڵ و کۆششی کۆمەڵن و "پلە مەزنەکان"ی بەرهەمی ڕەوشت جوانیی سەرجەمی کۆمەڵەکەش، گەر بە هی "سەرۆك" یان

"مامۆستا" یان "ڕابەر"ی ئەو کۆمەڵە دابنرێن، ئەوا ستەمێکی گەلێ مەزن لە مافی ئەو کۆمەڵە دەکرێت، لە هەمان کاتیشدا - ئەم کارە - ستەمێکی ئاشکرایە لە خودی ئەو سەرۆك و مامۆستایە.

چونکە ئەم چەشنە کارانە ختووکەی "خۆویستی"ی شارراوە و پەنهانی ناوەوەی ئەو مامۆستا و سەرۆکە دەدات و بەرەو "لەخۆبایی بوون"ی دەبات! دەبینیت لەکاتێکدا کە ئەو مامۆستایە جگە لە پاسەوان و دەرگاوانی کۆمەڵەکەی زیاتر نییە، کەچی لە ئەنجامی ئەو بۆچوونە هەڵەیەدا، لە پۆشاکی پادشادا خۆی دەنوێنێت و بەو شێوەیە خۆی دەخاتە وەهمی خەڵکییەوە. خۆ - وەك ئاشکرایە - بەم کارەی ستەم لە خۆی دەکات، تەنانەت لەوانەیە ئەم وەهمەی ڕێیەکی بەرەو جۆرێکی شیرکی پەنهان لێ بکاتەوە.

بەڵێ، ئەگەر سەربازەکانی تابوورێکی سوپا قەڵایەکی سەخت بگرن، سەرکردەکەیان مافی ئەوەی نییە دەستکەوتەکانی جەنگ بۆ خۆی هەڵبگرێت و سەرکەوتنەکەشیان بە هی خۆی لە قەڵەم بدات!

لەبەر ئەوە، نابێ مامۆستا و ڕابەر وەك سەرچاوە سەیر بکرێن. بەڵکو دەبێ وەك ئاوێنەیەکی دەرخەر و تیشکدەرەوە تەماشا بکرێن، چەشنی ئەو ئاوێنەیەی کە گەرمی و ڕووناکیی خۆر دەداتەوە.

چونکە ئەوپەڕی گێلی و گەلحۆییە گەر ئاوێنەکە بە سەرچاوەی ئەو ڕووناکی و گەرمییە بزانرێت و خودی خۆر لە یاد بکرێت و، پاشان تۆش بایەخ و ڕەزامەندی بەرامبەر بەو ئاوێنەیە دەرببڕیت لە بریی خۆرەکە خۆی!

بەڵێ ڕاستە، دەبێ پارێزگاریی ئاوێنەکە بکرێت، چونکە دەرخەرێکە سیفەتەکانی خۆر دەداتەوە. کەواتە "ڕۆح" و "دڵ"ی ڕابەر دوو ئاوێنەی

ده‌رخه‌رن، ئه‌و ڕێزنه‌ په‌روه‌ردگاری‌یانه‌ ده‌ده‌نه‌وه‌ كه‌ له‌ لایه‌ن خواوه‌نده‌ی حه‌قه‌وه‌ به‌سه‌ریاندا باریوه‌.

به‌م جۆره‌، "ڕابه‌ر" ده‌بێت به‌ هۆكاری دانه‌وه‌ی تیشكی ئه‌و ڕێزنانه‌ به‌ره‌و موریده‌كه‌ی. هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌شه‌ كه‌ نابێت ئه‌و ڕابه‌ره‌ پله‌یه‌كی له‌ هی خۆی زیاتری بدرێتێ كه‌ پله‌ی "هۆكاری دانه‌وه‌ی ئه‌و ڕێزنانه‌یه‌".

خۆ ده‌شگونجێ ئه‌و مامۆستایه‌ی كه‌ وه‌ك سه‌رچاوه‌یه‌ك ته‌ماشا ده‌كرێت، نه‌ سه‌رچاوه‌ بێت و نه‌ ئاوێنه‌ی تیشكده‌ره‌وه‌ش، به‌ڵكو ئه‌و ڕێزنانه‌ی كه‌ موریده‌كه‌ له‌ ڕێیه‌كی تره‌وه‌ به‌ده‌ستی هێناون، به‌هۆی ئیخلاسه‌ بێگه‌رده‌كه‌ی به‌رامبه‌ر مامۆستاكه‌ی و له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ ته‌نها چاوی له‌وه‌ و به‌ بۆنه‌ی نزیكیی لێیه‌وه‌ و په‌یوه‌ندیی خه‌ست و خۆڵی پێیه‌وه‌، له‌ ئاوێنه‌ی ڕۆحی شێخه‌كه‌یدا بیانبینێت و پاشان به‌ هی ئه‌ویان بزانێت!

ئه‌م موریده‌ له‌مه‌دا وه‌ك ئه‌و كه‌سه‌ وایه‌ كه‌ به‌ خه‌واندنی موگناتیسی خه‌وی لێ خرابێت؛ چونكه‌ ئه‌میش - وه‌ك ئه‌و - دوای ئه‌وه‌ی كه‌ به‌ چڕی ڕوانینی خۆی ئاراسته‌ی ئاوێنه‌كه‌ ده‌كات، ده‌رگایه‌ك له‌سه‌ر جیهانی میسال بۆ ئه‌ندێشه‌ی ده‌كرێته‌وه‌ و، له‌وێوه‌ چه‌ندین دیمه‌نی سه‌یر و سه‌رسووڕهێنه‌ر ده‌بینێت.

له‌ ڕاستیدا ئه‌و دیمه‌نانه‌ له‌ناو ئاوێنه‌كه‌دا نین، به‌ڵكو له‌و په‌نجه‌ره‌ ئه‌ندێشه‌یه‌وه‌ دیبانبینێت كه‌ له‌ پشتی ئه‌و ئاوێنه‌یه‌وه‌ن و، له‌ ئه‌نجامی ته‌ماشا كردنی چڕ و خه‌ستی ئاوێنه‌كه‌وه‌ ئه‌و په‌نجه‌ره‌یه‌ له‌ ئه‌ندێشه‌ی ئه‌و كراوه‌ته‌وه‌.

له‌به‌ر ئه‌وه‌، ده‌گونجێ موریدێكی خاوه‌ن ئیخلاسی شێخێكی ناكامڵ، له‌ شێخه‌كه‌ی كامڵتر بێت و بۆ ڕابه‌رایه‌تی كردنی شێخه‌كه‌ی لێ ببڕێت و ببێت به‌ شێخی شێخه‌كه‌ی!

## یادخەرەوەی چواردەهەم

ئـەم یادخەرەوەیـە (چـوار) هێمـای بچووكـی تێدایـە، تایبـەتن بـە "تەوحید"ەوە:

✿ هێمای یەكەم:

ئەی مرۆڤی هۆكارپەرستی پشت بەهۆ بەست!

بزانە كە تۆ شوێن كڵاوی بابردوو كەوتوویت!

چونكە گەر بە چاوی خۆت كۆشكێك ببینیت كە لە چـەندین گەوهـەری سـەیر و نـامۆ بنیـات بنرێت و، هـەندێ لـەو گەوهـەرانەش لـە كـاتی بنیاتنـانی كۆشـكەكەدا لە وڵاتی چین و هەندێكی تری لـە ئـەندەلوس و هـەندێكی تـری لە یەمەن و هەندێكی تری لە سیبریا نەبێت لە شوێنی تر دەست نەكەون، ئنجا بە چاوی خۆیشت ببینیت كە بە جوانـترین شێوە كۆشـكەكە بـەو گەوهەرانـە بنیات بنرێت و لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا و باكوور و باشـوورەوە و بەوپـەڕی خێرایی و لە هەمان ڕۆژدا ئەو گەوهەرانەی بۆ ئامادە بكرێت..

ئەگـەر بـە چـاوی خـۆت ئەمـە ببینیـت، ئایـا هێشـتا هـەر گومـانت لـەوەدا دەبێـت كـە توانسـتی وەسـتای بنیاتنـەری ئـەو كۆشـكە بەسـەر هـەموو گـۆی زەویدا زاڵ و بەدەستەڵاتە؟

بە هـەمان جـۆر، هـەموو بوونـەوەرێك، بـە تایبـەتی "مـرۆڤ" خانووبـەرە و كۆشـكێكی خواییـە، چونكـە مـرۆڤ جوانـترین و سەرسـووڕهێنەرترینی ئـەو گشـت كۆشـكانەیە. ئەوەتا هەندێ لـە بـەردە گرانبـەهاكانی ئـەو كۆشـكە هـی جیهانی "ڕۆح"ن و، هـەندێكی تریـان هـی "جیهـانی میسـاڵ" و، "لەوحـی مەحـفووز" و، بەشێكی تریان هـی جیهانی "هـەوا" و، جیهـانی "نـوور" و، جیهانی "توخـمەكان"ن..

ئنجا – جگە لەمەش – پێداویستی‌یەکانی ئەم کۆشکە (واتە مرۆڤ) تاکو "هەتاهەتایی" درێژخایەنن و، ئاواتەکانیشی بە هەموو کەنار و گۆشەیەکی زەوی و ئاسمانەکاندا بڵاوبوونەتەوە و، پەیوەندی‌یەکانیشی لە ناخی گشت چینەکانی دنیا و قیامەتدا ڕیشکیان داکوتاوە.

دەسا ئەی ئەو مرۆڤەی کە خۆی بە مرۆڤ دەزانێت!

تۆ کۆشکێکی گەلێ سەرسوورپهێنەر و بینایەکی بەکجار سەیر و نامۆیت. جا مادەم چییەتی(ماهیة)ی تۆ بەم جۆرەیە، ئەوا بەدیهێنەرت تەنها ئەو کەسەیە کە (بە چەشنی ئاسانیی گواستنەوەی نێوان دوو مەنزڵ و دەست تێوەردان لە کاروبارەکاندا) دنیا بۆ قیامەت دەگوێزێتەوە و کاریان ڕادەپەڕێنێت. هەروەها (بە ئەندازەی ئاسانیی هەڵدانەوەی دوو لاپەڕەش) ئاڵوگۆڕ لە زەوی و ئاسمانەکاندا دەکات و، هێندەش بە ئاسانی دەست لە "ئەزەل" و "ئەبەد" وەردەدات کە دەڵێیت ئەم دوانە – لای ئەو – وەك "دوێنێ" و "سبەینێ" وان!

کەواتە جگە لەو کەسەی کە فەرمانڕەوای زەوی و ئاسمانەکانە و دنیا و قیامەتی بەدەستە، کەسی تر ڕزگارت ناکات و شایانی ئەوە نی‌یە کە تۆ بیپەرستیت و هانای بۆ لا بەیت!

✿ هێمای دووهەم:

هەندێ کەسی نەفام کە "خۆر" نەناسێت گەر وێنەی خۆر لەناو ئاوێنەدا ببینێت، ئەو خۆشەویستی‌یەی کە بۆ خۆر هەیەتی یەکسەر ئاراستەی ئاوێنەکەی دەکات. لەبەر ئەوە، بە هەڵپەیەکی زۆرەوە و لە پێناوی هێشتنەوە و لەدەست نەچوونی خۆرەکەدا پارێزگاریی ئاوێنەکەی دەکات!

بەڵام گەر پەی بەوە بەرێت کە: بە تێکشکان و مردن و نەمانی ئاوێنەکە خۆرەکەی نامرێت و لەناوناچێت، ئەوا ڕاستەوخۆ خۆشەویستی‌یەکەی

ئاراستەی ئەو خۆرە دەکات کە لە ئاسماندایە. ئنجا هەست دەکات کە خۆری ناو ئاوێنەکەی شوێنکەوتەی ئاوێنەکە نییە و مانەوەشی بە مانەوەی ئاوێنەکەوە بەند و پەیوەست نەکراوە، بەڵکو - لە ڕاستیدا - مانەوەی ورشە و پرشنگ و بریسکانەوەی ئاوێنەکە پشت بە مانەوە و ڕووبەڕوو بوونەوەی درەوشانەوەکانی خۆرەوە دەبەستێت. کەواتە مانەوەی ئاوێنەکە بە مانەوەی خۆرەوە بەندە، نەك بە پێچەوانەوە.

دەسا ئەی کاکی مرۆڤ!

"دڵ" و "کاکڵە" و "چییەتی"ی تۆ ئاوێنەیە. ئەو خۆشەویستی و حەزکردنەشت لە "مانەوە" کە لە سروشتتدا ڕیشکی داکوتاوە، لە پێناوی درەوشانەوەی ناوی: "الباقي"ی خواوەندی شکۆمەنددایە، کە ناوێکە بە گوێرە و ئەندازەی توانا و لێهاتنی هەر مرۆڤێك لە سروشتی ئەو مرۆڤەدا دەدرەوشێتەوە. بەڵام ئێستا ئەنجامی گێلی و گەلحۆیی مرۆڤە کە ڕووی ئەو خۆشەویستییە بەرەو لایەکی تر ئاراستە کراوە!

جا مادەم وایە، ئەوا هەردەم بڵێ: "يا باقي أنت الباقي" چونکە مادەم تۆ - ئەی خواوەندی باقی! - هەیت و دەمێنیتەوە، ئیتر "نەمان" چیمان پێ دەکات با بیکات، هەرچییەکمان بهێنێتە ڕێ ئێمە گوێی نادەینێ!

✿ هێمای سێ‌هەم:

کاکی مرۆڤ! یەکێك لەو شتە سەیرانەی کە بەدیهێنەری دانا لە ماهییەتی تۆدا دایناوە، ئەوەیە کە:

هەندێ کاتی وا هەیە لەم دنیا فراوانەدا جێت نابێتەوە و وەکو بەندکراوێك لە بێزاریدا خەریك بێت بخنکێت بێزار دەبیت و دەڵێیت: "ئۆف.. ئۆف" بە دوای جێیەکی لە دنیا فراوانتردا دەگەڕێیت! کەچی کاتی

واش هەیە لەناو تۆوە خەرتەلەیەك، یان ختوورەیەك كە بە دڵتدا بێت، یان لەناو شتێکی وردا، جێت دەبێتەوە بە ڕادەیەکی وا کە تیایدا ون دەبیت!

هەروەها "دڵ" و "بیر"ت کە لەم دنیا زەبەلاحەدا جێیان نابێتەوە، کاتی وا هەیە لەناو گەردیلەیەکی بچووکدا جێی خۆیان دەکەنەوە و، بە وردترین و تیژترینی هەستەکانیشت لەناو ئەو ختوورەیەدا هاتوچۆ دەکەیت!

بەدیهێنەری دانا چەندین لەتائیف (واتە چەندین لایەنی ناسك)ی ورد و مەعنەویی لە ماهییەتی تۆدا داناوە کە هەندێکیان گەر دنیا هەڵبلووشێت هێشتا هەر تێر نابێت.. هەندێکی تریشیان جێی گەردیلەیەکی تێدا نابێتەوە و گەندەموویەك هەڵناگرێت، چەشنی "چاو" کە جێی موویەکی تێدا نابێتەوە و، "سەر" کە چەندین کۆڵی قورس هەڵدەگرێت. جا لەو لایەنە نەرم و ناسکە، جێی سەنگی تاڵە موویەکیشی تێدا نابێتەوە. واتە باروودۆخێکی زۆر کەمیش هەڵناگرێت کە لە گومڕایی و بێ ئاگاییەوە پەیدا بوو بێت، بەڵکو پێی دەمرێت و تروسکایی لێ دەبڕێت..

کەواتە ئاگادار بە و بە ئەسپایی هەنگاو بنێ.. وریابە نوقم نەبیت.. نەکەی لە: پارووێک، یان وشەیەك، یان بریسکانەوەیەك، یان ئاماژەیەك، یان بەرەڕووەکێك، یان ماچێکدا بخنکێیت و ناسکترین لەتائیفیشت لەگەڵتدا بخنکێن، لەوانەی کە دنیا قووت دەدەن!

چونکە چەندین شتی تابڵێی وردی ئەوتۆ هەن کە لە ڕوویەکەوە دەتوانن مەزنترین شت لە خۆیاندا جێ بکەنەوە.

گەر حەز دەکەیت لەمە دڵنیا بیت، فەرموو سەیری ئاوێنەیەکی بچووك بکە و بزانە چۆن ئاسمان بە هەموو ئەستێرەکانیەوە لە ناویدا نوقم دەبێت. یان سەرنجی "حافیظە"ی خۆت بدە کە ئەوەندەی تۆوە خەرتەلەیەکە، با بزانیت

چۆن خواوەندی حەق زۆربەی ئەو شتانەی لە لاپەڕەی کردەوەکانی خۆت و تەمەنتدا هەن، لەودا تۆماری کردوون.

دەسا پاکی و بەرزی و بێگەردی بۆ لەو بەدیهێنەرەی کە هێندە بەتوانایە و، ڕاگیرکەری هەموو شتێکی ناو گەردوونە!

✿ هێمای چوارەم:

ئەی مرۆڤی دنیاپەرست!

ئەم دنیایەت کە پێت وایە فراوانە، لە ڕاستیدا وەك گۆڕێکی تەنگ وایە. بەڵام لەبەر ئەوەی دیوارەکانی لە ئاوێنە دروست کراون و وێنەکانی یەکتریان تێدا دەردەکەوێت، ئەوا هەتا چاوت بڕ دەکات بە فراوانی دەزانیت!

هۆی ئەمەش بریتییە لەوەی کە: دیواری لای ڕاست و دیواری لای چەپی ئەم دنیایە کە بریتین لە "ڕابوردوو" و " داهاتوو" هەرچەند هەردووکیان "نەبوو"ن، کەچی وەك ئاوێنە وان؛ وێنەی یەکتریان تێدا دەردەکەوێت و، دوو باڵی کاتی تەسك و کەم و کورتی "ئێستا" لەو دوو ئاوێنەدا فراوان دەردەکەون..

ئا لێرەوە "ڕاستی" تێکەڵی "ئەندێشە" دەبێت و، دنیا "نەبوو"ەوەکەی لە بەرچاودا دەبێت بە "بوو"..

هەروەك ئەگەر هێڵێکی ڕاست - کە تاڵێکی باریکە - بە خێرایی بزوێنرێت، وەك تەختاییەکی فراوان لە بەرچاودا دەردەکەوێت، دنیاکەی تۆش وەهایە، لە ڕاستیدا گەلێ تەنگ و تەسکە. بەڵام بەهۆی گومانی ئەندێشەت و بە بۆنەی بێ ئاگاییتەوە دیوارەکانی لە یەکتر دوور کەوتوونەتەوە و مەوداکەشی فراوان بووە. بە ڕادەیەك کە ئەگەر

گمرو گرفتێك بێتە ڕێت و لەتاوا سەر بحوولێنیت، سەرت بەر ئەو دیوارە دەکەوێت کە تۆ پێت وابوو گەلێ دوورە لێتەوە! ئنجا ئەندێشەکەت دەفڕێت و خەوەکەشت لێ‌دەزڕێت و دەبینیت دنیا فراوانەکەت گەلێ لە گۆڕ تەنگ و تەسکترە و، دەشزانیت کات و تەمەنت لە هەورە بروسکە زۆر خێراترە و ژیانیشت لە ڕووباری ئاو گەلێ بەخوڕترە!

جا مادەم ژیانی دنیا و گوزەرانی ماددی و ژینی ئاژەڵی ئا بەم جۆرەیە، ئەوا خۆت لە ئاژەڵێتی دائماڵە و دەست لە ماددیگەری دابشۆ و، بە پلەکانی ژیانی "دڵ"دا سەربکەوە.. ئەو کاتە ژیانێکی گەلێ فراوانتر و جیهانێکی یەکجار بەرینتر دەبینیت لەچاو لەوەی کە پێشتر لە جیهانە فراوانەکەتدا گومانت دەبرد.

کلیلی ئەو جیهانە یەکجار فراوانەش بریتی‌یە لە: ناسینی خوا و "زمان" خستنەگۆ و "دڵ" بزواندن و "ڕۆح" خستنەکار بەو واتا و نهێنی‌یانەی کە لە وشەی پیرۆزی "لا إله إلاّ الله"دا هەن.

## یادخەرەوەی پازدەهەم

بریتی‌یە لە سێ مەسەلە.

□ مەسەلەی یەکەم[(١)]:

ئەی ئەو کەسەی دەیەوێت بەڵگەیەك لەسەر ڕاستیی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە ببینێت کە ئاماژە بۆ درەوشانەوەی هەرە تەواوی ناوی جوانی: "الحفيظ"ی خوای گەورە دەکەن:

---

(١) بەڵام مەسەلەی دووەم و سێ‌هەم و یادخەرەوەکانی تر، دانەر لەم نامیلکەیەدا دایناون. بەڵکو هەریەکەیانی کردووە بە پەیامێکی سەربەخۆ، وەك پەیامەکانی: "ئیخلاس و، پۆشتەیی(حیجاب) و، سروشت و، سێ ئاماژەکان.. هتد". (وەرگێڕ)

﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ ۞ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ (الزلزلة:٧-٨)!

درەوشانەوەی هەرە تەواوی ناوی "الحفیظ"ی خوای گەورە و، هاووێنەی ئەو ڕاستی‌یەی کە لەم دوو ئایەتەدا هەن، لە هەموو شوێنێکدا پەرش و بڵاون. دەتوانیت بۆ خۆت لە ڕێی بیرکردنەوە و سەرنجدانی لاپەڕەکانی کتێبی بوونەوەرانەوە هەستی پێ بکەیت. ئەو کتێبەی کە بە کێش و سەنگ و ڕاستە و پێوانەی "کیتابی موبین" نووسراوەتەوە.

فەرموو - بۆ نموونە - پڕی مشتێك تۆوی جۆراوجۆری گوڵ و درەختە هەمەچەشنەکان هەڵبگرە، کە تێکەڵ و پێکەڵن و لە ناوەڕۆکدا لە یەك جیاوازن و بەڵام لە قەبارە و شێوەدا لە یەك دەچن. پاشان ئەو تۆوانە لە تاریکستانی گڵێکی ساکاری بێ گیاندا بنێژە، ئنجا بەو ئاوەی کە توانای هەڵسەنگاندنی نی‌یە و شتان لێك جیا ناکاتەوە و بەرەو هەر لایەك ئاراستەی بکەیت دەڕژێت و دەڕوات، ئاودێریی بکە..

پاشان لە وەرزی بەهاردا - کە گۆڕەپانی حەشر و زیندوو بوونەوەی ساڵانەیە - سەری لێ بدە و بە سەرنجەوە سەیری بکە و بزانە کە چۆن مەلائیکەتی هەورە بروسکە - وەکو ئیسرافیل - بۆ بانگێشت کردنی باران فوو بە شەیپوورەکەیدا دەکات و مژدەی زیندووبوونەوەی پاش مردن بە تۆوە نێژراوەکانی ژێر گڵی زەوی دەدات!

ئەوەتا بە چاوی خۆت دەبینیت ئەو تۆوانە، کە لەوپەڕی تێکەڵی و لەیەکچووندان، لەبەر تیشکی ڕووناکیی درەوشانەوەی ناوی "الحفیـــظ"دا گوێڕایەڵیی بێ هەڵە و تەواوی ئەو فەرمانە تەکوینی‌یانە دەکەن کە لە لایەن بەدیهێنەری دانایانەوە بۆیان دێت، ئیتر هەموو کارو هەڵسوکەوتێکیان لەگەڵ

ئەو فەرمانانەدا دەگونجێنن و ڕێكیان دەخەن، بە چەشنێ كە بریسكانەوەی كەماڵی دانایی و، زانین و، ویست و، مەبەست و، هەست و نەستیان تێدا هەست پێ دەكرێت.

ئایا نابینیت ئەو تۆوە تێكەڵ و لەیەكچووانە چۆن ئێستا لە یەكتری جیا دەبنەوە و هەریەكەیان شێوەیەكی جیاواز لەوانی تر وەردەگرێت؟ ئەوەتا ئەم تۆوەیان بووە بە درەختێكی هەنجیری ئەوتۆ نیعمەتەكانی بەدیهێنەری دانای خۆی بەسەر لق و پەلەكانیدا پەخش كردووەتەوە و بە دەستی پەلەكانی پێشكەشمانی دەكات..

یان سەیری ئەو دوو تۆوە لەیەكچووانە بكە كە یەكێكیان بووە بە گوڵەبەڕۆژە و ئەوی تریان بە گوڵەوەنەوش، ئەمانە و هاوونێنە زۆرەكانی تریان لەو گوڵە قەشەنگ و ناسك و خەملاوانەی كە خۆیان بۆ ئێمە ئارایشت داوە و بە ڕوویەكی گەشەوە بۆمان دەڕوانن و خۆیانمان لە لا خۆشەویست دەكەن..

هەروەها چەندین وردیلە تۆوی تر دەبینیت كە ئێستا بوون بە چەندەها میوەی تام خۆش و بەلەزەتی ئەوتۆ كە ئێمەی مرۆڤ حەزمان لێیانە..

یان بوون بە چەند گوڵە دانەوێڵەیەكی پڕ و چەند نەمامە درەختێكی تازە پێگەیشتوو كە بە تام وچێژە بەلەزەتەكانیان و بۆن و بەرامەی عەترینیان و ڕوخسار و لەشولارە ناوازەكانیان خولكمان دەكەن و بەرهەمەكانیانمان پێ دەبەخشن، تاكو لە پلەی ژیانی ڕووەكیەوە پلەیەك زیاتر بەرز ببنەوە و سەربكەون و پلەی ژیانی زیندەیی بەدەست بهێنن.

ئەم تۆوانە بە ڕادەیەكی وا فراوان گەشەیان كردووە و پەرەیان سەندووە كە ئەو لەوێچە تۆوە بە فەرمانی بەدیهێنەریان چەندین گوڵی جۆراوجۆر و

درەختی هەمە چەشنیان بەرهەم هێناوە و باخچەیەکی بە گوڵ خەملاوی ڕەنگین و بەهەشتێکی ڕازاوەی بەرینیان سازداوە. سەرنج بدە و بزانە ئایا هیچ هەڵە و ناتەواوی‌یەك دەبینیت:

﴿فارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُور﴾ (الملك:٣)؟

هەریەك لەو تۆوانە، بە بۆنەی لێ درەوشانەوە و چاکەکاریی ناوی جوانی "الحفيظ"ی خوای گەورەوە، هەموو ئەو شتانەی دەرخستووە کە لە بنەچە و باپیرانیەوە بە میرات بۆی بەجێ ماوە، بێ ئەوەی گرفتاری هیچ جۆرە ناتەواوی و هەڵە و لێ تێکچوونێك بێت..

جا ئەم خواوەندە پارێزکارەی کە ئەو پارێزگاری کردنە خاوەن ئیعجازە بە ڕوونی ئەنجام دەدات، بەم کارەی ئاماژە بۆ درەوشانەوەی هەرە مەزنی "پارێزکاری"ی ڕۆژی حەشر و قیامەتی هەرە مەزن دەکات.

بەڵێ، دەرخستن و پیشاندانی کەمالی "پاراستن" و "چاودێری"ی خواوەند لەم شتە کەم نرخ و فانی و لەناوچووانەدا، بێ هیچ ناتەواوی‌یەك، بەڵگەیەکی گەلێ گرنگ و بەهێزە لەسەر ئەوەی کە ئەو خواوەندە شتانی زۆر لەوە گەورەتر و گرنگتر و کاریگەرتر دەپارێزێت و لێیان دەپرسێتەوە، چەشنی ڕەفتاری جێنشینانی گۆی زەوی و گوفتاری هەڵگرانی ئەمانەت و، چاکە و خراپەی بەندەکانی خوای گەورەی تاك و تەنیا.

﴿أَيَحْسَبُ الإِنْسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدَى﴾ (القيامة:٣٦)؟

ئایا مرۆڤ وا گومان دەبات پشتگوێ دەخرێت و لێپرسینەوەی نایەتەڕێ؟

نەخێر.. مرۆڤ بۆ ژیانی هەمیشەیی زیندوو دەکرێتەوە و، دەستنیشان کراوی: بەختەوەریی هەمیشەیی یان بەدبەختیی هەتاهەتاییە و، لەسەر کەم و زۆر و گەورە و بچووکیی ڕەفتار و گوفتارەکانی بەرپرسیارە. ئیتر لە ئەنجامدا

یان پاداشتی کردەوەی چاك وەردەگرێت، یان سزا و تۆڵەی ڕەفتارە چەواشەکانی دەچێژێت.

بەم جۆرەی کە بینیمان، چەندەها بەڵگە و نیشانە و شایەتیی لە سنوور بەدەر هەن لەسەر درەوشانەوەی ناوی "الحفیظ"ی خوای گەورە.

ئەم نموونەیەی کە دەتوانیت نموونەی تری لەسەر بدۆزیتەوە، مشتێکە لە خەروارێك و.. لەوێچێکە لە دەریایەك و.. دەنکە لمێکە لە بیابانێك و.. خاڵێکە لەسەر گۆنای تەپۆڵکەکانی ناو دەشتاییەك و.. دڵۆپێکە لە بارانی بە لێزمە و زوڵاڵی ئاسمانی بەهارێك!

کەواتە، بەرزی و جوانی و خاوێنی بۆ ئەو خوایەی کە پارێزەر و چاودێر و ئاگادارە و، لە هەموو شتێك دەپرسێتەوە!

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيم﴾.

* * *

لە پەیامی "مونازەرات"ەوە:

## چی دووچاری زایەبوونی کردووین؟

پرسیار:

چی ئێمەی بە زایە داوە و لە کاروباری بەرز سستی کردووین؟

وەڵام:

"ژیان" بریتییە لە جموجووڵ و چوست و چالاکی.. "شەوق"یش ئەسپە بۆ ژیان و هیممەتی مرۆڤ..

جا هەرکات هیممەتی ئێوە سواری ئەسپی شەوق دەبێ، ئەوا لە مەیدانی ژیاندا بە دوای کاروبارە بەرزەکاندا دەگەڕێ. تا لەم کاتەدا یەکەم شت دێتە ڕێی "نائومێدی"یە، کە دوژمنێکی سەرسەختە و هێزی هیممەت لاواز دەکات..

ئێوەش بە شمشێری ئەم ئایەتە پیرۆزە لێی بدەن کە دەفەرموێ:

﴿لا تَقْنَطُوا..﴾ (الزمر:٥٣)..

پاشان "حەز لە خۆدەرخستن" و "ئارەزووی سەرکەوتن بەسەر کەسانی تردا" دێتە مەیدان، کە مەیل و ئارەزوویەکە لە مرۆڤدا ڕەگی داکوتاوە و دەیەوێ لە ئیشوکاری خزمەتکردنی حەقدا - کە خزمەتێکە لە حەسوودی و قرە دوور و بێگەردە - زاڵ بێت. بەم پێیە دەستی خۆی لە سەروگوێلاکی هیممەت دەوەشێنێ و لەسەر ئەسپەکەی دەیخاتە خوار..

ئێوەش لەم کاتەدا حەقیقەتی ئەم ئایەتە پیرۆزەی ئاراستە بکەن کە دەفەرموێ:

﴿كونوا قوّامين..﴾ (النساء:١٣٥)..

پاشان "پەلەکردن" لە مەیداندا دەردەکەوێ و پێی هیممەت دەخلیسکێنێ و، بازی بەسەر هەنگاوەکانی ڕێکخستنی "هۆکار" و "بەهۆکراوەکان" پێ دەدات و، قۆناغە یەك لە دوای یەکەکانی هۆکارەکانی لێ تێك دەدات، بەمەش بەرەو دواوە پاشەوپاش دەیباتەوە..

ئێوەش دەبێ لە سەنگەری بێ وەیی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا خۆتان بپارێزن کە دەفەرموێ:

﴿اصبروا وصابروا ورابِطُوا..﴾ (آل عمران:٢٠٠)..

پاشان "ڕای شەخسیی خۆسەپێن" و "بیرکردنەوەی تاکە کەسی" کە ئەنجامی کردەوەی مرۆڤ تەفروتوونا دەکات، لە هیممەت دەردەپەڕێ، کە دەبوو ئەمەی نەکردایە و بەپێی سروشتی خۆی لە نێوان مافی کەسانی تردا چاودێریی مافی خۆی بکردایە..

دەبێ ئێوەش بە حەقیقەتی بەرزی ئەم فەرموودە پیرۆزە بەرەنگاری ببنەوە و بەربەستی بکەن کە دەفەرموێ:

(خيرُ الناسِ أنفعُهُم للنّاسِ)[1]..

ئنجا دوژمنێکی تر دێتە مەیدان؛ ئەویش "چاولێکەری"یە. ئیتر بەمە دەرفەتی دەست دەکەوێ بۆ چاولێکردنی تەمبەڵان و دواکەوتووان. ئەم چاولێکەرییە پشتی هیممەت دەشکێنێ..

---

(١) حديث حسن أخرجه القضاعي في مسند الشهاب وابن عساكر في تاريخ دمشق ٢/٤٢٠/٢ وانظر الصحيحة ٤٢٦ وصحيح الجامع الصغير وزيادته برقم ٦٥٣٨. (وەرگێڕ)

ئێوەش بە حەقیقەتی بەرزی ئەم ئایەتە لێی دەربپەڕێن کە دەفەرموێ:

﴿لايضرُكُمْ مَنْ ضَلَّ إذا اهتَدَيْتُم﴾ (المائدة:١٠٥)..

تاکو دەستی دوژمن نەگاتە داوێنی هیممەت.

پاشان دوژمنێکی غەددار دەردەکەوێ، کە "کار دواخستن"ە. ئەمەش لە ئەنجامی دەستەوسانی و متمانە بەخۆ نەبوونەوە پەیدا دەبێ و، لەمەشەوە دواخستنی کارەکانی دوارۆژ "لەمڕۆوە بۆ سبەینێ" دروست دەبێ و، ئەم کارەش درێژە دەکێشێ هەتا دەستی هیممەت دەبەستێت و نایەڵێ هەڵسێتەوە..

ئێوەش دەبێ شوێن نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەون کە دەفەرموێ:

﴿وعلى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلوُنَ﴾ (ابراهيم:١٢).

واتە: تەنها پشت بە خوا ببەستن، نەك غەیری خوا. کەواتە "تەوەککول" بکەن بە قەڵای هیممەت..

پاشان دوژمنە مولحیدەکە دێتە مەیدان کە "خۆهەڵقورتاندنە لەو ئیشوکارانەی تەنها هی خوای گەورەن".

ئەم دوژمنە، زللە توند و سەخت و بەئازارەکانی خۆی لە سەروگوێی هیممەت دەوەشێنێ، تا کوێری دەکات..

ئێوەش ئەو حەقیقەتە جیددی و هەمیشە سوودبەخشەی ئەم ئایەتە پیرۆزەی ئاراستە بکەن کە دەفەرموێ:

﴿فاستَقِمْ كَما أُمِرْتَ﴾ (هود:١١٢)..

تاکو لە سنووری خۆی ڕابیگرێ و نەیەڵێ ئەو سنوورە بشکێنێ، چونکە بەندە بۆی نییە بێت بە فەرماندەی گەورەکەی خۆی.

لە کۆتاییدا "حەز لە حەوانەوە و ڕابواردن" دێتە گۆڕێ، کە سەرچاوەی هەموو بەڵایەك و هێلانەی گشت کردەوەیەکی خراپە و، بە کۆت و زنجیرەکانی خۆی هیممەت دەبەستێتەوە و، نایەڵێ بە دوای کاروبارە بەرزەکاندا بگەڕێ و، بەم حاڵەوە دەیهاوێتە هەڵدێری نزمی و زەلیلی‌یەوە..

دەبێ ئێوەش بەرەو ڕووی ئەم ساحیرە خوێن مژە لەو پاڵەوانە موجاهیدە بنێرن کە لەم ئایەتەدایە:

﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلإِنْسانِ إِلاَّ ما سَعَى﴾ (النجم:٣٩).

بەڵێ ڕاستە، لە جیهاد و هەڵگرتنی ئەرکە قورسەکاندا گەلێ حەوانەوەتان دەست دەکەوێ.

هەر کەسێکیش خاوەنی سروشتێکی هەستیار بێت، حەوانەوەی خۆی تەنها لە کار و کۆششدا دەبینێتەوە.

* * *

# پێرستی بابەتەکان